# بینای تاکی ڕۆشەنبیر

نووسینی: د. ادریس کاریتانی



چاپی یەکەم ١٤٤٠ك- ٢٠٢٠ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
بینای تاکی ڕۆشەنبیر، د. ادریس کاریتانی(نووسەر)
١٢٠ لاپەڕە،
١٤ * ٢١ سم
بابەت، ئایینی
ISBN: 978-9922-632-20-9

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٤٧٤) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین : عمر عثمان عمر
خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی



﴿ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴾سورة البقرة الآية : ١٥١.

عن أبي هريرة (رَضِيَ الله عنه)، عن النبي (ﷺ)، أنه قال: ((لا يُلْدَغُ المؤمنُ من جُحْرٍ مرتين))" رواه الشيخان.

دیارییه بۆ:

- ✓ هەموو ئەوانەی بەدوای رۆشەنبیریەکی قووڵ و فراوان دەگەرین.
- ✓ هەموو ئەوانەی لەچوارچێوەی قووڵی قورئان و سوننەتدا دەیانەوێ کومەڵگا رۆشەنبیر بکەن.
- ✓ هەموو ئەوانەی بیر لەهەستانەوەو نەهزەی کومەڵگا دەکەنەوە.
- ✓ هەموو ئەوانەی هەست بەپاشەکشەی کومەڵگا دەکەن لەروی رۆشەنبیری و وشیاریەوە.
- ✓ هەموو ئەوانەی دەیانەوێ لەسیناریو دروستکراوەکان شارەزا بن.

## سەرە قەڵەمێك

- ڕۆشەنبیری و مەعریفە بۆچی؟
- ئاستی ڕۆشەنبیرمان زۆر لاوازە!!!؟
- دونیای تەكنەلۆژیاو سۆشیال میدیاكان نیشانەی لاوازی بواری ڕۆشەنبیریمان نیشان دەدەن!!!.
- هۆكاری لاوازی ڕۆشەنبیری و مەعریفە لای بەشێك لەموسڵمانانی ئەمڕۆ
- نیشانەكانی لاوازی ئاستی ڕۆشەنبیری كومەڵگا
- ڕاگەیاندن و ڕۆشەنبیری تاك و لێكەوتە خراپەكانی
- ڕۆشەنبیر كێیە؟
- ڕۆڵی ڕۆشەنبیر
- سیمای تاكی ڕۆشەنبیر
- دارِشتنی بینای ڕۆشەنبیرو مەعریفی
- سەرچاوەی سەرەكی بینای ڕۆشەنبیری و مەعریفە نیگایە (الوحي).
- چۆن بینای ڕۆشەنبیری و مەعریفی بكەین لە ڕێگەی وەحی؟.
- پۆلێن كردنی وەحی بەسەر ڕۆشەنبیری و مەعریفەو زانیاری

- پەیوەندی وەحی بە ڕۆشەنبیری و مەعریفەو زانستە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ
- زانیاری ڕۆشەنبیری و مەعریفی لەوەحی دا
- تایبەتمەندییەکانی وەحی .
- پێوەری ڕۆشەنبیری و مەعریفە و زانست لە قورئاندا.
- پێوەری ئەخلاقی ڕۆشەنبیری و مەعریفە و زانست و زانیاری لە قورئاندا.
- پێوەرە زانستییەکانی قورئان بۆ گواستنەوەی ڕۆشەنبیری و مەعریفە و زانست .
- سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوەی دووەمی ڕۆشەنبیری و مەعریفەو زانست و زانیارییە .
- سوننەت کاکڵ وکرۆکی ڕۆشەنبیری و مەعریفەو زانست و زانیاریە بۆ تاکی موسلمان.
- سوننەت وەك سەرچاوەی ڕۆشەنبیری و مەعریفە و زانست و زانیاری لە ڕووی ئایینیەوە .
- ڕۆشەنبیری و زانیاری و زانست و مەعریفە مرۆییەکان لەنێو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).
- کەلەپوری ئیسلامی سەرچاوەی ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفەیە.
- کەلەپوور (التراث) مانای چیە؟

- گرنگی کەلەپووری ئیسلامی...
- پێوەر و بنەماکانی هەڵسەنگاندنی کەلەپووری ئیسلامی
- چۆن کەلەپووری ئیسلامی بکەینە سەرچاوەی زانستی و مەعریفە؟
- هەمەچەشنی رۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لە کەلەپووری ئیسلامی دا
- سەرچاوە کانی تری رۆشەنبیرو مەعریفە و زانست
- پیشنیار
- دەر ئەنجام.

## سەرە قەڵەمێک؛

لەوەتەی مرۆڤ هاتۆتە سەرزەوی لە خۆ رۆشەنبیرکردن و گەشەسەندن و بەرەو پێش چوون بەردەوامە، ئەگەر چی لەهەندێك کات و شوێن و زەمانیك بەشێکی پاشەکشەی کردوە، بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی هەوڵی رۆشەنبیری و زیرەکی ودانایی و وشیاری خۆی داوە ، بەدوای زانست گەراوەو خۆی تێدا بەهرەمەند کردوە ، بە سروشتی خۆی حەزی لەرۆشەنبیری و زانست و وشیاریەو بەبی زانیاری رازی نابیٚ، ململانێی زانیاریش لەنیوان مروڤەکان هەر هەبووە وبوّتە پالّنەریکی بەهێز بو گەشەسەندن و زانست و زانیاری و مەعریفە، قورئان و سونەتی سەحیحی پیغەمبەر(ﷺ) دوو سەرچاوەی سەرەکی و دوو مەوسوعەی پر بەهای رۆشەنبیری و مەعریفەی تاکی موسلمانە، بۆیە موسلمان دەبیٚ وشیارو داناو زاناو ئاگادارو زیرەك و ژیرو روشنبیر بیٚ ، پیێچەوانە لەگەلٚ خەلّکانی تر، چونکە زانیاری لەم دو سەرچاوەیە وەردەگری کە هەڵەی تێدا نیە و قەبولّی هەڵە ناکات، هەروەها زانیاریەکان لەچوارچێوەی بنەماو رۆشەنبیری گشتین، لەبوارەکانی کومەلاٌیەتی و سیاسی و فکری و گەشەپێدان و ئابوری و فەرهەنگی و تادەگاتە

ئەدەب و میژوو بەشەکانی تر، هەروەها بەهوی عەقڵەوە بونەوەرو ژیان دوو سەرچاوەی گەورەی ژیری و داهێنان و بیرکردنەوەو وشیاریین، تاوەکو تاك رۆشەنبیر بێ و خاوەنی مەعریفەیەکی گشتگیرو هەمە لایەن بێ.

هەر کات تاکی موسلمان رۆشەنبیرو داناو زیرەك و وشیار نەبوو" ئەوە لای داوە لەسروشتە فیترییەکەی خۆی، هەروەها ئەوە کەم و کوری هەیە لەهەوڵ و تێکوشان و تێگەیشتنی ڕاست و دروست لەم سەرچاوانە، کەم و کوڕی هەیە لەبەکارهێنانی عەقڵ بەشێوەیەکی تەندروست، کەم و کوڕی هەیە لەپڕۆژەو بەرنامەی خۆ رۆشەنبیرکردن و پەیداکردنی مەعریفە، موسلمان ئەگەر لەچاوگی رۆشەنبیری ئیسلامی هەڵهێنجێ چەند بنەمایەکی بەهیزی رۆشەنبیری جیاواز لەرۆشەنبیری گەلانی تر بەدەست دینی لەوانە:

١- بینای عەقلێکی هاوسەنگ بەرهەم دینێ.

٢- ئامانج و هەدەفی ژیانی زور ڕون دەبێ.

٣- ئیمانێکی قوڵ بەدەست دێنی.

٤- ئینتیمایەکی تەندروستی دەبێ.

٥- چەند جارێك لەکونیکەوە پێی وەنادرێ.

٦- رووبەڕووی باتڵ دەبێتەوەو باش دەیناسێ.

٧- هەوڵی ئاوەدانکردنەوەی ژیان دەدات.

٨- مەبادیئەکان بەدەست دێنی بەشیوازێکی واقیعیانە.

٩- کارەکانی ڕێك دەخات لەچوارچێوەی ئیدارەیەکی جوان و ڕێك و پێك.

١٠-خاوەن ئەخلاقێکی بەرزو بەڕێز دەبیٚ.

١١-وشیارو ئاگادارو ژیر دەبیٚ.

١٢-بەرامبەرەکانی دەناسیٚ.

١٣-دۆست و دوژمن لێك جیادەکاتەوە.

١٤-پێگەیەکی بەهێزی کومەڵایەتی دەبێت.

١٥-پێشەنگی بەدەست دینیٚ...... هتد.

د. ادریس کاریتانی

١-١-٢٠٢٠ هەولیر

# بینای تاکی رۆشەنبیری و مەعریفی بۆچی؟

بۆ هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەیەکی واقیعی و ژیرانە، بۆ رووداوە یەك لەدوای یەکەکانی ئەمڕۆی جیهان و روژهەڵاتی ناوەراست و کوردستان، پێویستیمان بەزۆرترین مەعریفە و رۆشەنبیری هەیە، تا بتوانین روداوەکان بەجوانی بخوێنینەوەو تێی بگەین، بزانین ئاراستەکە بەرەو کام لایە، لەکوێوە هاتووە؟ کێ دروستی کردووە؟ پشت بابەتەکە چیە و چۆنە؟ بەکام پێوەر سودو زیانەکانی دیاری بکەین؟ تا موسلمان نەکەویتە نێو داوی تەڵەکەبازو سیاسەتی میکیافیلی ئەمڕۆ.

دونیا گۆڕاوە، وەك جاران نەماوە بتوانی بەکەمترین زانیاری و رۆشەنبیری و مەعریفە روداوەکان بخوێنیەوەو تێیان بگەی، ولاتانی روژئاوا سەدان کەسایەتی رۆشەنبیرو سیاسەتمەداری پسپۆریان دروست کردوە، سەدان سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی سیاسی و فکری و فەرهەنگی و بوارەکانی دبلۆماسیان کردوّتەوە، زۆربەیان لەسەر ئەساسی پسپۆری و تایبەتمەندی دانراون، بۆ هەر بڕیارو ڕوداوێك زۆرترین دیراسە دەکەن و وردەکاری تێدا ئەنجام دەدەن، کەسانی رۆشەنبیرو شارەزا بەکار دەهێنن تا نەکەونە هەڵەوە، هەمو روداوو بڕیارەکانیش بۆ خۆیان ڕابکێشن، نەخشە ڕێگا بۆ (١٠٠) ساڵ

دادەڕێژن، زۆر جار چۆنیان نەخشە كێشاوە ئاوها دەردەچێ و هەڵەی تێدا ناكەن، جگە لەتەكنەلۆژیای سەردەم كە ئەویش هەر ئەوان خاوەن و داڕێژەرینە، ئێستا رۆشەنبیری و مەعریفەش هەر ئەوان داڕێژەرینە، لەبەر كەمی زانیاریمان زورینەی نەخشە و پیلانەكان خۆمان بۆیان جێ بەجێی دەكەین، زەرەرو زیانیش هەر ئێمە دەیدەین، خێرو بێری هەمو ولاٚتانی ئیسلامی بەم ژیری و شارەزاییەی خۆیان بردویانە، لەولاشەوە بێ زانیاری و نەبونی رۆشەنبیری و مەعریفی ئێمە وای كردوە داهاتی ئێمە بۆ ئەوان بێ.

رۆشەنبیری و مەعریفە بنەمای سەرەكی مروڤ بونە ، لەنیو مروڤەكانیشدا سیمای جوانی موسڵمانانە، ئەمرو موسڵمانان ئەم سیمایە جوانەمان لەدەست داوە، لەدواوەی میللەتانین بەتایبەت لەهەندێك بواری رۆشەنبیری و زانیاری ، بەنمونە: لەبواری زانستی و ژینگەیی و پەیوەست بەیاساو ریساو ئیدارەدان و وەرزشی و تەندروستی و كۆمەڵیك بواری تر، ڕاستە لە بواری خودا پەرستی و ئەخلاقی و كۆمەلاٚیەتی زۆر لەپێشەوەین و سەرمەشقی میللەتانین، بەلاٚم پێویست دەكات لەهەموو بوارەكاندا رۆشەنبیری فراوانمان هەبی و مەعریفەمان رەنگ بداتەوە لەتەواوی ژیان و ژینگەماندا.

ئەگەر بەراوردیك لەنیوان ئێمەی موسڵمان و روژئاوا بكرێت لەرووی رۆشەنبیریەوە دەردەكەوی ئێمە زۆر زۆر لەدواوەی ئەوانین، لەرۆشەنبیری سیاسی و فكری و فەرهەنگی و ژینگەیی و رێساو یاساكانی ژیان و

ئیدارەی ژین، تەنها لەبواری ئیمانی و ئەخلاقی و کومەڵایەتی وەك گوتم لەلوتکەداین.

ئەم بابەتانە وای لەبەندە کرد ئەم نوسراوە بەگوشراوی بخەمە بەردەستی خوینەری تاکی موسڵمان، تا بتوانین بنەمای رۆشەنبیری و مەعریفەمان دابرێژین و خومان پر لەزانیاری و رۆشەنبیری و مەعریفە بکەین. دور کەوینەوە لەنەزانی و نارۆشەنبیری و بێ ئاگایی.

## ئاستی رۆشەنبیرمان زۆر لاوازە !!!؟

بەرزی ئاستی رۆشەنبیری هەر میللەتێك نیشانەی شارستانیەت و وشیاری میللەتەکەیە، بەداخەوە میللەتی کورد بەهۆی پیگە جوگرافیەکەی بەدرێژایی مێژوو شارستانیەتێکی سەربەخۆی نەبوە، بەتایبەتی لەم سەد سالەی دوایی چەوسانەوەو ژیردەستەی میللەتانی زۆر بینیوە، کاتێك خاوەنی دەوڵەتداری خۆی نەبوە نەیتوانیوە شارستانیەتێکی گشتی بونیات بنێ، هەر چەندە زیرەکی و وشیاری گەلی کورد زۆر بەرزە، بەلام زیرەکی بەتەنها بەس نیە، دەوڵەتداری دەتوانێ بینای رۆشەنبیری و شارستانیەت بکات، ئەم هۆکارانە کاریگەریان زۆر بەجێ هێشتوە لەسەر تاکی کورد، بەتایبەتی لەململانی سیاسیەکان زیاتر دەردەکەوێ کە ئاستی رۆشەنبیری سیاسیشمان زور لاوازە، ململانێی سیاسی کارێکی نورمەڵ و سروشتیە

لەنێوان پارتی سیاسی، بەڵام لەکوتاییدا دەبێ ئەم ململانێیە خزمەت بەکومەڵگاو نیشتیمان و تاکەکان بکات، نەك میللەت پارچە پارچە بکات، پەرتەوازەیی و ڕق و قین و ناو زڕاندنی یەکتر و تانەو تەشەر و تانەلێکتردان و بوختان کردن بەیەکترو تەخوین و بەکافر کردنی یەکتر، لەوانەیە جاری واهەیە بگاتە پیلان گێران بۆ یەکتریش، لەبیرمان نەچێ شەڕی برا کوژی هۆکارەکەی تەنها ململانێی سیاسی و نەبوونی رۆشەنبیری بوو.

پرۆسەی سیاسی و ململانێی هەلبژاردن تەمەنی لەکوردستان بۆ ٢٧ ساڵ دەگەڕێتەوە، کەچی ساڵ بەساڵ برینەکان قوڵتر دەبنەوەو دوژمنایەتی پەرە دەسێنێ و نارۆشەنبیرتر دەبین، لەهەمو ولاتان هەڵبژاردن هەیە بەڵام دوای تەواو بون ڕێکدەکەون لەسەر خزمەتکردنی گەل و نیشتیمان. لەناو پارتە ئیسلامیەکانیش هوشیاری رۆشەنبیری سیاسی لاوازە، کاتێك تاکێك لەگەڵ پارتێکی سیاسیە بانگەشەی بو دەکات و بەچاکترین پارتی سیاسی دادەنێت، لەڕێی ئەو دەبیتە وەزیرو پەرلەمانتارو ئیمتیازات وەردەگرێت، بەڵام کەگرفتێك لەنێوانیاندا دروست دەبێ حیزبەکە بەجێ دەهێڵێت، هەردولا دەست دەکەن بە تانەو تەشەر کردن بەیەکتر و یەکتر بەخیانەتکار وەصف دەکەن، پێشتر هەردولا زۆر دڵسۆز بون و پاك و بێگەرد بون! کەچی ئێستا خراپ و دونیاویست و خیانەتکار.

میللەتانی دونیا بەشێکیان لەم روەوە لەپێش ئێمەن ، ئێمە

پێویستمان بە رۆشەنبیریەکی گشتگیر هەیە تا لەچوارچێوەی فکرو شارستانیەت و پروژەی هەمە لایەن خزمەت بە گەل و نیشتیمان بکەین.

## دونیای تەکنەلوژیاو سوشیال میدیاکان نیشانەی لاوازی بواری رۆشەنبیریمان نیشان دەدەن!!!.

دیارترین بەرهەمەکانی مروڤ لەم سەردەمەدا تەکنەلوژیای سەردەمە، خزمەتیکی بی وینەی بەمروڤایەتی کردوە، بوّتە جوانترین سیمای رۆشەنبیری و شارستانیەت، بەشیك لەم تەکنەلوژیایە فەیسبوك و سۆشیال میدیایە، روژئاوا فەیسبوك و سۆشیال میدیا بەناوەندی رۆشەنبیری و مەعریفەو هوشیاری کومەڵایەتی دادەنێت، تاکەکانی زۆر پێشخستوە، بۆتە چەقی رۆشەنبیری و زانیاری و هوشیاری کومەلایەتی و سیاسی و فکری و فەرهەنگی ، لەزۆربەی وڵاتان فەیسبوك بۆتە تاکە رێگەی وەرگرتنەوەی ماف و ئازادییەکان، هەندێ جاریش تەختی زۆردارو دکتاتورەکانی سەردەمی لەرزاندوە، یان روخاندویەتی، هەموو تاکێکی کردۆتە خاوەنی راگەیاندنێکی سەربەخۆی خۆی ، تا بۆچوون و رەئیەکانی خۆیان بگەیننە دونیا، هەروەها بەئاسانی رۆشەنبیری و زانیاری لەتەواوی جیهان وەردەگری، توانای خۆشی پەخش دەکات، کەچی لەنێو کومەڵگای ئێمە چۆن لەزوربەی لایەنەکانی تر لەدواوەین، لەفەیسبوك و سوشیالیش تا ئیستا نەمانتوانیوە سیمایەکی جوان

پێشكەش بكەین كە ئاماژە بێ بەشارستانیەت و رۆشەنبیریمان، بەتایبەتی جنێودان كە كارێكی زۆر قێزەون و نامروڤانەیە ، ناشارستانی و نارۆشەنبیرانەیە، بۆتە دیارترین سیمای فەیسبوك، هیچ تاكێك لەسەر بۆچونی جیاواز پارێزراو نیە لەجنێودان، جا ئەم تاكە كەسێكی ناودار بێ یان هەر پێگەیەكی كۆمەڵایەتی هەبێ، زۆر ئاساییە بۆچوونی جیاواز دەربرێ بەلاٚم هیچ یاسایەكی خودایی و ئەخلاقی و ...هتد رێگەی نەداوە مروڤ لەسەر بوچونی جیاواز جنێو بدات، ئەگەر سەیری كومێنتەكان بكەی بەراستی سیمایەكی زور ناشیرین نیشان دەدات، پێمان دەلێت هێشتا زۆرمان ماوە بەمیللەتێكی خاوەن رۆشەنبیری و شارستانیەت لەقەلەم بدرێین !!!.

## هۆكاری لاوازی رۆشەنبیری و مەعریفە لای بەشیک لەموسلمانانی ئەمرۆ

ئاورێك لە مێژوی ١٠٠ ساڵی پێشوومان بدەینەوە بێگومان زانیاری و رۆشەنبیری و مەعریفەو وشیاری موسلمانان لەلوتكە بوە، بۆتە جێگەی تێرامان و سەرسام بوونی جیهان، هەروەها زاناو نوسراوەكانیان سەرچاوەی سەرەكی بوون بۆ تەواوی میللەتان ، بویە سەردەمی زێرینیان تۆمار كرد، جیهان شاهێدی ئەم راستیە دەدات، بەلام دوای روخانی خەلافەت و هەڵوەشانەوەی چەتری موسڵمانان كە دەسەلاٚت و حوكمی سیاسی بوو، دوای ئەمە لەهەموو بەشەكانی

بازرگانی و کشتوکال و پیشەسازی پاشەکشەی کرد، دیارە لەبواری ڕۆشەنبیری و مەعریفەو زانیاریش پاشەکشەی کرد، بەتایبەتی دوای جیهانگیری و پیشکەوتنی سەردەم و شۆرشی زانیاری، لەمیدیا و بوارە زانستیەکان زیاتر دەردەکەویّ کەرۆشەنبیری و مەعریفەی بەشێك لەموسڵمانانی ئەمرو وەك پێویست نیە و لەئاستێکی لاواز دایە، هەروەها لەکاتی روودانی رووداوەکان و خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنیان وادەردەکەوێت کە زانیاریەکانمان زور لاوازن، ئەوەش وای کردووە ئومێد بۆ هەستانەوەو نەهزە کەمتر بیت، موسلمانان نەبوون بەسەرچاوەی سەرەکی بۆ رۆشەنبیری و مەعریفەو زانیاری، هۆکارەکەش بۆ چەند شتێك دەگەرێتەوە لەوانە:

١- سەرچاوەی پاراستن و گەشەسەندنی هەموو رۆشەنبیری و زانیاریەك لەژیر چەتری دەوڵەت ودەسەلاّتی سیاسی دەبێت، موسڵمانانیش ئێستا لەژێر چەتری دەوڵەتی عەلمانین و چەتری خۆیان نەماوە.

٢- دارشتنی مەنهەجی خوێندن و بوارە زانستی و پەروەردەییەکان لەژیر دەستی موسڵمانان نین، ئەمانەش سەرچاوەی سەرەکین بو رۆشەنبیری و مەعریفە و زانیاری.

٣- مەنهەجی خوێندنی زانستە شەرعیەکان و حوجرەکانی مزگەوت لەڕوی رۆشەنبیریەوە مەنهەجێکی لاوازە! بوارەکانی ریسالەو نەهزەو رۆشەنبیری و مەعریفەو ئیدارەو ئابوری تێدا نیە.

٤- خیتابی ماموستایانی ئایینی کە سەرەکی ترین سەرچاوەیە بو

وەرگرتنی رۆشەنبیری و زانیاری و مەعریفە، زور ناواقیعین و لەچوارچێوەی میسالیاتن ، تەرکیز لەسەر بواری خواپەرستی دەکری بەتەنها، بەبێ فیکرو ژیری و تێڕامان و بیرکردنەوە، هەروەها یەك لایەنە واتە تەنها رێکخستنی نێوان بەندەو خودا باس دەکەن، هیچ باسێکی پەیوەندی نیوان مروڤ و بونەوەرو ژیان نیە، زۆرینەی موسلمانانیش سەرچاوەی وەرگرتنی رۆشەنبیری و مەعریفەیان مزگەوت و مینبەرو گوتارەکانن.

٥- بەشێکی زۆر لەسەرکردە سیاسیە ئیسلامیەکان دەرچووی مەدرسەی شەرعی و حوجرەی مزگەوتەکانن، واتە هەڵگری هەمان زانیاری و زانستی ئەم مەنهەجانەن کەدەخوێندری، کەمتر وایە دەرچوی کولێژەکانی زانستی سیاسی و قانون سیاسە و بوارە سیاسی و دبلۆماسیەکان بن، بۆیە ئەم زانیاریانە دادەبەزن بو نێو ئورگانەکانی نێو حیزب و تاکەکانی کومەڵگا، ئەمەش بونەتە هۆکاریکی تر بو لاوازی رۆشەنبیری و مەعریفە.

٦- گەران و سەفەر کردن بەولاتان و دیتنی ئاستی رۆشەنبیری و تەجروبە و شیوازی جیای گەلان، ئاستی رۆشەنبیری و مەعریفە زیاد دەکات، دیارە تاکی کورد بەهۆی نەبوونی کیانیکی سەربەخو، هەروەها تێپەربوونی بەنێو ئەم هەموو کارەساتە سیاسی و ئەمنی و ئابورییە، وای کردوە کەمتر بتوانێ بەوڵاتاندا بگەرێ و سود

لەتەجروبەی جیاواز ببینی و رۆشەنبیری و مەعریفەی گەلان کوبکاتەوە.

٧- شەپۆلی بەناو قورئان و سوننە بەپالّپشتی سەلەفیەکان و ولاتی سعودیە، لەژێر بریاری ئەمریکا، جارێکی تر رێگای بیرکردنەوەی زیاتری لەموسلمانان داخست! وای لەموسلّمانان کرد بەناوی قورئان و سوننەوە هیچ بیرنەکەنەوە! بەلّکو بەزاهیر لەگەلّ وشە بژین و هەلّس و کەوت بکەن، نەك لەگەلّ روح و کاکلّ و مەقاصیدو ناوەڕۆکی بەرزو پیروزی قورئان و سوننەتی سەحیحی پیغەمبەر(ﷺ)، کە پڕە لەرۆشەنبیری و مەعریفە و زانیاری، هەروەها بیئاگان لەوەی کە قورئان و سونەتی سەحیح داوای بیرکردنەوە دەکات بو فراوان کردنی ئاسوی مەعریفەو زانیاری و رۆشەنبیری. ورد بونەوەو لێکولّینەوەو بیرکردنەوەو وشیاری و دانایی و زیرەکی بنەمای سەرەکی قورئانە. ئەوە سونەتی سەحیحی پیغەمبەرە (ﷺ) پێمان دەلّیت ئیماندار (کیس، فطن، حذر). ئەمە قورئان و سوننەتە نەزانی و جەهالەت و داماوی و تەقلیدو چاولێکەری لێمان قەدەغە کردووە. ئەوە قورئان و سوننەتی سەحیحە داوا دەکات داهێنان بکەن و هەنگاوی پەرەسەندن بهاوێژن و دونیا ئاوەدان بکەنەوە.

٨- بەهۆی روداوە سیاسیەکان و گۆرەپانی سیاسی فراوان، رۆژ بەرۆژ تاکی موسلّمان پشتی لەخوێندنەوە کردوە، کەمترین رێژەی خوێندنەوە لەلای موسلّمانانەوەیە.

٩- زاڵبونی گوتاری عاتیفی بەبێ بنەمای فکرو بیرکردنەوە، ئەمەشیان لاوازی رۆشەنبیری زیاد دەکات.

١٠- بی ئاگایی لەبەرزی و بەهێزی و فراوانی رۆشەنبیری و مەعریفەی ئیسلام و شەریعەت.

١١- ئەو راگەیاندنانەی لەلایەن ئێمەوە بەرێوە دەبردرێن لاوازن ، ئەمانیش بوونەتە سەرچاوەیەك بۆ زانیاری و رۆشەنبیریمان ، لەچوارچێوەی هەمان زانست دەسورێنەوە.

١٢- بێ متمانەیی بەئیمان و بڕوای خۆمان، ناتوانین لەگەل خەڵکی غەیری خۆمان تێکەڵ بین، تا زۆرترین زانیاری ئاڵو گوڕ بکەین، متمانەمان بەئیمانی خۆمان نیە، دەترسین خەلك کاریگەریمان لێ بکات و بمان گۆڕێ! ئەمەش کارەساتە ئیمانمان ئەوەندە لاواز بێ بترسین لەهەموو بیردۆزو ئایدیایەکی تر.

## نیشانەکانی لاوازی ئاستی رۆشەنبیری کومەڵگا

کومەڵگای پێشکەوتوو سیمای پێشکەوتنی تاکەکانیەتی چەندە تاکەکانی رۆشەنبیرو هوشیارو ژیر بن ئەوەندە کومەڵگاکە سیمای شارستانی و رۆشەنبیری پیشان دەدات ، پێچەوانەکەشی هەمان ئەنجامان دەداتێ بەلام بەڕووە سەلبیەکەی، واتا ئەگەر تاکەکان دواکەوتوو نارۆشەنبیر بن ئەوا کومەڵگایەکی نارۆشەنبیرو دواکەوتوو لاوازی لێ دەرچێت، ئەم نارۆشەنبیریەش چەند نیشانەو ئاماژەیەك نیشان دەدات وەك سیمایەکی لاواز دەردەکەوێت، ئەم سیما لاوازانەش لەنێو هەر کومەڵگایەك هەبوو ئەوا ئاستی رۆشەنبیری ئەم کومەڵگایە لاوازە لەوانە:

١- عاتیفە و سۆزداری تاکەکان زاڵ دەبێ بەسەر عەقڵ.

٢- خەون گێرانەوەو دیتنی خەون دەبێتە دیارترین سیمای تاکەکان.

٣- سیحرو کەهانە و نوشتەو جن و ئەم بابەتانە زۆرترین باس و بابەت دەبن.

٤- شتی سادەو ساکار زورترین بینەری دەبێ.

٥- بەسەرهات و قسەی بێ بنەماو لاواز زۆرترین بازاری دەبێ.

٦- خەڵکی بێ مستەوا زوو گەورە دەبێ.

٧- دینداری بەروكەش زور دەبیّ .

٨- قۆلّبرین بەناوی دینداری زۆر دەبیّ و خەلّكیش هەست پیّ ناكەن.

٩- سیناریو دیارترین بابەت دەبیّ بو بەكارهیّنانی كۆمەلّگا.

١٠- هەر كەس بیەویّ بەئاسانی خەلّك بۆ خۆی و فكرەكەی بەكار دەهینیّ بەناوی دین و نیشتیمان و قەومیەت.

١١- بابەتی جدی و نەهزەوی و فكری خویّنەری نامیّنیت، تەنها كەسانیّكی كەم نەبیّ.

١٢- خەلّك بەشكلّ و شیّواز دەناسریّتەوە نەك بەكارو كردەوە.

١٣- خویّندنەوە و دیراسات و بەدواداچونی زانستی باوی نامیّنیّ.

١٤- كتیّب و رۆژنامەو گۆڤار كەمترین خویّنەری دەبیّ.

١٥- بیركردنەوەی قوولّ و ئامانجدار كەم دەبیّ.

١٦- متمانە بەخۆبوون لاواز دەبیّ.

١٧- قدوەكان (چاولیّكراوەكان) بەدوای عاتیفەی خەلّك دەكەون.

١٨- پیّشەنگ و قدوەكان ئاستی نەهزەو فكرو هەستانەویان لا غایب دەبیّ.

١٩- كەسانی سادەو فەنان و خاوەن زوبان دەبنە قوتبی رەبانی و بەشیخولئیسلام وەسف دەكریّن.

٢٠- موفەكیرو خاوەن مەبدء بەنەزان و نەفام ناوزەد دەكریّت.

٢١- هەندیّك لەنەخویّندەوارو گورانی بیّژ یاسا بۆ میللەت دادەریّژن و دەبنە پەرلەمانتار.

٢٢- تەقلیدو چاولێکەری سیمای کومەڵگا دەبێ.

٢٣- ئەهلی اختصاص و پسپۆری کەم دەبێ، خەڵك تەنها لەزانیاری گشتی شارەزا دەبێ.

٢٤- مادەو پارەو پول پێوەر دەبێ بۆ کەسایەتی و هەڵسەنگاندنی کەسەکان.

٢٥- هەموو کەس خۆی بەقدوە و زانا دەزانی لەئەصلیشدا وانیە.

٢٦- هەڵخەڵەتاندنی سیاسی و فکری زور دەبێ.

٢٧- دەسەلاتی سیاسی دکتاتورو نادیموکراسی گەشە دەسینێ.

٢٨- زوڵم و ستەم زۆر دەبێ و ناداد پەروەری بڵاو دەبێتەوە.

٢٩- کاری چاکە زۆری بۆ رووکەش و چاوی کامێرا دەبێ، واتە خێرخوازی شاراوە کەم دەبێ.

٣٠- مروڤ بەهای لاواز دەبێ، شتەکانی تر لەکومەڵگا بەهادارتر دەبن لە مروڤ.

## ڕاگەیاندن و ڕۆشەنبیری تاک و لیکەوتە خراپەکانی

سەدەی بیست و بیست ویەك کارو کاریگەری ڕاگەیاندن گەیشتە لوتکە، لەرووی کاریگەری لەسەر تاك و کومەڵگا لەدەسەلاتی چوارەمەوە بووە دەسەڵاتی یەکەم، ئەمەش بەهۆی گواستنەوەی زانیاری خێراو جیهانی عەولەمەوەیە، جاران زۆرترین زانیاری و ڕۆشەنبیری تاکەکان لەرێگای جیاواز و ئورگانی تر گەشەی دەکردو پەرەی دەسەند، ئێستا ڕاگەیاندن زۆرترین کاریگەری هەیە بەسەر ڕۆشەنبیرکردنی تاکەکان ،دەتوانین بڵێین هیچ تاکیك نیە ئەمرو بینای بەشێکی زۆری ژیانی ڕۆشەنبیری لەسەر ڕاگەیاندن بینا نەکات.

ڕاگەیاندن بەهەر سێ بەشی بینراوو بیستراوو نوسراوەو بۆتە زەرورەتێکی گرنگ لەژیانی هەموو تاکێك ، تەنانەت وای لێهاتووە تاك نەتوانێ روژانە چەند سەعاتێك لەوێستگەکانی ڕاگەیاندن دابڕێ، لەولاتە ژیرو ڕۆشەنبیرو پێشکەوتوەکان ڕاگەیاندن شوێنی زۆر دام و دەزگای حکومی پرکردۆتەوە بۆ گەیاندنی زانیاری و ڕۆشەنبیرکردنی تاکەکانی کومەڵگا، بەنمونە ئەگەر دەوڵەت بیەوێت ڕۆشەنبیری سیاسی ، تەندروستی یان ژینگەیی ...یان هەر بابەتێکی تری ڕۆشەنبیری پێویست بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا بلاْو بکاتەوە، حەملەی بو

ڕادەگەیەنێت و هەموو ڕاگەیاندنەکان دەخاتە کار بۆ ماوەیەکى کەم بنەماى تاکى ڕۆشەنبیر دادەمەزرێنى.

ململانێى ڕاگەیاندنەکان لەسەر پێشکەشکردنى زۆرترین هەواڵ و زانیارى زۆر سودى بەتاکەکانى کومەڵگا گەیاندوە، بۆ ئەوەى بەکەمترین کات زۆرترین زانیارى جیاواز وەربگرێ، تاکیش تا زانیارى زیاتربێ ڕۆشەنبیرتر دەبێ، بەڵام بەداخەوە لەوڵاتى ئێمە چونکە هەرێمەکەمان لەزۆر لاوە بێ پلانە و زوربەى سێکتەرەکان کەوتونەتە ژێر کاریگەرى حیزبە دەسەڵاتدارەکان و گەندەڵى زۆرى تێکەوتوە، بێ گومان ڕاگەیاندنەکانیش بەشى گەورەیان بەرکەوتوە، لەبرى گەشەى تاك و کومەڵگا بەشێکیان هەوڵى پاشەکشەى تاك و کومەڵگا دەدەن، بروایان وایە تا کومەڵگا پاشەکشە پێ بکەن ئەوا سودمەندى مادى دەبن و درێژە بەدەسەڵاتەکەیان دەدەن، چەندان لێکەوتەى خراپیان خستۆتەوە نێو کومەڵگاى کوردى لەوانە:

١- ئاستى ڕۆشەنبیرى تاکەکانیان لاواز کردوە.

٢- یەکریزى کومەڵگایان تێك داوە.

٣- دوبەرەکى و دژایەتیەکى زۆریان خستۆتە نێو تاکەکانى کومەڵگا.

٤- ئینتیماى نیشتیمانیان لاواز کردوە.

٥- ململانێى قووڵیان خستۆتە نێو تاکەکان.

٦- خەڵکیان لەسەر مادەگەرایى ڕاهێناوە.

٧- چەواشەکاری زۆر دەکەن.

٨- چاوپۆشی و لێبوردەیی کەسیمای جوانی کوردەواری بووە زۆر کەم بووە.

٩- یەکتر قەبوڵ نەکردن لەنێو تاکەکان گەشەی کردوە.

١٠-وێنای کومەڵگای کوردی ناشیرین کردووە.

١١-ئینتیمای حیزبایەتی خستۆتە پێش ئینتیمای دین و خاك و نیشتیمان.

١٢-هەماهەنگی و هاوکاری تاکەکانی لێك ترازاندوە.

١٣-میللەتی کورد زۆر گرنکی بەلایەنی ئەخلاقی داوە ئەوان بوونەتە هۆی لاوازی بوارە ئەخلاقیەکان.

١٤-متمانەیان لەنێوان تاکەکان نەهێشتووە.

١٥-شیرازەی خێزانیان تێك داوە.

ئەمانە هەمووی هۆکارن بو لاواز کردنی ئاستی رۆشەنبیری تاك.

## هوکاری ئەم خالە سەلبیانەی راگەیاندن بۆچی دەگەریتەوە؟.

بەچەند بنەماو ریسایەکی ئەساسی هۆکاری کاریگەرییە خراپەکانی ڕاگەیاندن لەپاشەکشەی ئاستی رۆشەنبیری تاکەکانی کومەڵگا دیاری دەکەین:

١- ڕاگەیاندن لەولاتی ئێمە لەدەستی حیزبەکانە نەك لەدەستی حکومەت.

٢- هەر حیزبێك بەرژەوەندی خۆی و ئەندامەکانی لەچی دابێ ئەوە پەخش دەکات، نەك ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵگا دەیەوێت.

٣- پارەو بودجەی زەبەلاحیان بەدەستەوەیە لە کۆمەڵگاو لە فشاری تاکەکان ناترسێن .

٤- هیچ جۆرە لێپێچینەوەیەك نیە بەهەر شێوازێك کار بکەن سودی کومەڵگای تێدا بێت یان نا؟.

٥- ئەو یاسا ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندنانەی کەهەیە ناتوانێ فشار لەسەر ڕاگەیاندنەکانی حیزبە دەسەڵاتدارەکان دروست بکات.

٦- گرنگی بەهەواڵ و سیاسەت دەدرێت نەك رۆشەنبیر کردنی تاکەکان.

٧- ڕاگەیاندنەکان زیاتر لەچوارچێوەی بیری تاکەکانە نەك دامەزراوەیی.

٨- بابەتەکان ئامانجدار نین بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشەنبیری.

٩- خیتابەکان حیزبین نەك جەماوەری.

١٠-لە بواری ڕاگەیاندن کار بەپیوەرە ئەخلاقیەکان ناکرێت.

١١-نەبوونی بنەمای فکری لەڕاگەیاندنەکانەوە کەهاوڕا بێ لەگەڵ کومەڵگا.

١٢-بوونی دەیان بەناو ڕۆشەنبیری خۆفروش کە ڕێی هەڵەو چەواشەکاری لەبەرامبەر وەرگرتنی پارە بۆ ڕاگەیاندنەکان دادەنێن.

١٣-بێ دەنگی خەڵکی ڕۆشەبیرو بیرمەند و شارەزا لەژێر فشاری ترس ، یان موجامەلەی دەسەلات و بەرپرسەکان.

## ڕۆشەنبیر کێیە؟

ڕۆشەنبیر لەزمانەوانیدا لەوشەی (ثقف) هاتوە بەواتای (الحذق، الفطنة، سرعة الفهم ، الذكاء) واتە: کارامەیی، زیرەکی، لیهاتوویی، تیگەیشتنی خیرا..

هەروەها بەچەند وشەیەکی پر ماناو فراوان وەصف کراوە لەوانە: (كل مافيه استنارة للذهن، وتهذيب للذوق، وتنمية لملكة النقد) [1].

(١) سان العرب"، لابن منظور، دار صادر - بيروت، ١٣٨٨ هـ/ ١٩٦٨م، مادة (ثقف).

واتە: رۆشەنبیر بەرچاو روون و فکر رۆشنە، سەلیقەی پاك و بێگەردە، گەشەسەندوە لەرەخنە گرتنی بونیادنەرانە.

لەروی بەکار هینانیەوە: رۆشەنبیر ئەو کەسەیە بەرچاو رونە ئاگاداری روداوەکانی رۆژانەیە، هەروەها ئاگادار وزانایە بەسەر تەواوی بیردۆز و رەوتە کۆمەڵایەتی و فکری و زانستیەکان، هەڵگری بیرۆکەیەو توانای هەڵسەنگاندنی هەیە، پێشەنگە لەبڵاوکردنەوەی بوارە فکری و رۆشەنبیریەکان لەنێو کومەڵگا، کار لەسەر وشیارکردنەوەو بەرچاو رونی و رۆشەنبیر کردنی تاك و کومەڵگا دەکات.

## ڕۆڵی ڕۆشەنبیر

ڕۆشەنبیر دەتوانی روڵی سەرەکی ببینی لەنیو کومەڵگا لەوانە:

١- بڵاوکردنەوەی ڕۆشەنبیریەکی گشتکیر.

٢- بەرزکردنەوەی بەهای تاك و کۆمەڵگا.

٣- رەخنەگرتنی بونیاتنەرانە.

٤- گرنکی دان بەکێشەی کومەڵگا.

٥- بەدوای چارەسەری کیشەکان.

٦- بەرگری کردن لەبابەت و گرفتی کومەڵگا.

٧- وشیارکردنەوەی کومەڵگا لەخورافیات و بۆچوونی بیٚ بنەماو چاولیٚکەری.

٨- گرنکی دان بەگەشەسەندنی تاك و کومەڵگا.

٩- رولی ئەساسی دەبینی لەنێو کومەڵگا.

١٠-کومەڵگا ئاگادار دەکاتەوە لەهەر پیٚشهاتیٚکی ترسناك یان سودبەخش.

١١-قوربانی دەدات لەپیٚناو کۆمەڵگا.

١٢-مەبەد بڵاو دەکاتەوە و سەرخەری حەق و عەدالەتە.

١٣-هاوکاری هەمو کاریٚکی خیٚرە.

١٤-دژی زوڵم و ستەم و نادادگەری دەوەستی.

١٥-ئاستی تاکەکانی کۆمەڵگا بەرز دەکاتەوە لەرووی خوێندنەوەو هۆشیاری و دانایی و زیرەکی.

## سیمای تاکی رۆشەنبیر

تاکی رۆشەنبیر چەند سیماو رەوشت و ئاکارێکی هەیە پێی دەناسریتەوە لەوانە:

١- خاوەن زانیارییەکی فراوان بێت.

٢- هوشیارو دانا و ژیرو عاقڵ بێ.

٣- خاوەن بیرکردنەوەیەکی قووڵ بێ.

٤- خۆی بناسێ، ئاست و توانای خۆی بزانێ.

٥- بەرامبەرەکان بناسێ و نیسبەیەك سەرناسی تێدا بیت.

٦- روداوو واقیعەکان وەك خۆی بخوێنێتەوە.

٧- ئامانجی هەبێ لەژیان .

٨- پەند لەهەموو روداوێك وەرگرێ.

٩- نەخشەو پلانی هەموو چرکەیەکی ژیانی هەبێ.

١٠-قەبوڵی پێشنیارو ئامۆژگاری بکات.

١١-خاوەن پرۆژەی بەردەوام بێت.

١٢-زور بخوێنێتەوە.

١٣-قەبوڵی بۆچوونی جیاواز بکات.

١٤-لەکاتی گفتوگۆکردن لەسەر خۆو ئارام بێت.

١٥-توانای چارەسەر کردنی گرفتەکانی هەبێت.

١٦-خاوەن ئومێد بێت.

١٧-ئیجابیانە بیر بکاتەوە ، دور کەوێتەوە لەبۆچوونی سەلبی.

١٨-هەماهەنگ بێت لەگەڵ دەوربەری .

١٩-هەڵس و کەوتی خۆش و گونجاو بێت.

٢٠-دور بێ لەبریاری عاتفی و سۆزداری بێ بیرکردنەوەی قووڵ.

٢١-توانای چارەسەری گرفتەکانی هەبێ و بەسەریاندا زاڵ بێت.

٢٢-لەپێدانی زانیاری دەستکراوەو بەخشندە بیت.

## داڕشتنی بینای رۆشەنبیرو مەعریفی

بۆ چارەسەری هەر بابەتێکی بینای رۆشەنبیری و مەعریفی پێویستمان بە دیاریـکردنی گرفتەکە هەیە، ، دیارە فێربوون سەرچاوەی سەرەکی هەموو رۆشەنبیری و هەستانەوەو ئاوەدانـکردنەوەیەکە، لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین کەچۆن بینای رۆشەنبیری و مەعریفەو زانست و زانیاری تاك دابڕێژرێت؟ ئەمە بوٚتە گرفتێك، بێگومان سەرەتای چارەسەری ئەم گرفتە بە بینای تاکی رۆشەنبیرو مەعریفی دەبێت، واتا پێویستمانە بزانین چۆن بینای رۆشەنبیری و مەعریفی بکەین، بۆ ئەم مەبەستە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەو بنەماکان تا بزانین پەیوەندییان بە رۆشەنبیری و مەعریفەو زانست و فێربوون چییە؟.

## سەرچاوەی سەرەکی بینای رۆشەنبیری و مەعریفە نیگایە (الوحی).

سەرچاوەی تەواوی رۆشەنبیری و زانست و زانیاری دەگەڕێتەوە بۆ وەحی، ئەگەر بگەرێینەوە بۆ مێژووی سەرەتای دروستبونی مرۆڤایەتی، کە باوکمان ئادەمە دەبینین لەگەڵ دروستبوونی یەکەم مرۆڤ لەسەر زەوی بنەمای رۆشەنبیری و زانست و مەعریفەی بۆ دارێژراوە و تەواوی زانستەکانی فێرکراوە﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴾[1]. واتە: (خوای گەورە هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد)

شیخ الاسلام ئیبن تیمیە دەفەرموویێت: ( "المعرفة المكتسبة من الوحي معرفة يقينية مطلقة ذلك أن الوحي بصفته جزءًا من علم الله له ما لهذه الصفة من كونها حقيقة مطلقة غير محدودة، ودلالة الوحي في إفادة المعرفة الدينية دلالة شرعية سمعية وعقلية) [2].

واتە: مەعریفەو زانیاری وەدەستهاتوو لەوەحی مەعریفەیەکی یەقینیە و ڕەهایە، چونکە وەحی بەشێکە لەزانستی خودا کەواتە وەحی ئەم صیفەتەی هەڵگرتووە کە راستیەکی ڕەهایەو بێسنورە، بەڵگەداری وەحی بو زانستی ئایینی زانستێکی شەرعی و عەقڵیە).

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی ٣١ .

(٢) بڕوانە: مجموعة الفتاوى ابن تيمية، (١٣ – ١٣٦).

سەرچاوەی مەعریفە لەلای مادیەکان تەنها ئەوانەن کە بەجیهازە هەستیارەکان هەستیان پێ دەکرێ، یان عەقڵ دەرکیان پێ دەکات، بەڵام لەلای ئیمەی موسڵمان جگە لەم دوو سەرچاوە کە زۆر گرنگن و نیعەتێکن بەمرۆڤەکان دراوەو مروڤی لەتەواوی بونەوەر جیاکردووەتەوە، سەرچاوەیەکی بنچینەییە بۆ راستکردنەوەی هەڵەی ئەمانە، یان هەندێ زانست کەناتوانن درکی پی ببەن ئەویش وەحی خودایی، بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ لە مەنهەجی رۆشەنبیری و زانستی و مەعریفی و فێربوون جیابکرێتەوە، بەڵکوو تەواوی رۆشەنبیری و زانست و زانیارییەکانی بەستراوەتەوە بەم ئەصلە.

هەر زانستێك بەهۆی ئیجتهادات و عەقڵەوە بەدەستی بێنێ ودوور بێ لە پێوەرەکانی وەحی و تەنها پشت بە عەقڵ ببەستێ ئەوە لاڕێ دەبێ، ئاوڕێك لە تیۆریە بەشەرییەکانی سەدەی ڕابردوو بدەینەوە لەبیردوزو تیۆریەکانی داروین و نیتشە و دورکاریم و فرویدو هیگڵ و تەواوی تیۆریەکان، بەهۆی ئەم زانست و تیۆریە مەعریفیانە زوڵم و ستەم و نادادگەری وخوێنڕشتن و مرۆڤ کوژییان بەرهەم هێنا، جیهانیان پڕ لە ئاگر و ئاسن کرد ، تەواوی ئەولایەنانەی پەیوەندییان بە مرۆڤ هەیە شێوێندران و لەسەر بنەمای سروشتی و خزمەتی مرۆڤایەتی لادران.

رۆشەنبیری و زانستەکانی مرۆڤ پەیوەستە بە توانای کەسەکە و زەمان و مەکانێکی تایبەت و سەردەمێکی تایبەت، مرۆڤ ناتوانێ چارەسەری داهاتووی خۆی بکات، نازانێ گرفتەکانی زەمان و

مەکانێکی تر چییە و بەچی چارەسەر دەکرێ ؟ توانای عەقڵی وەك باقی بەشەکانی تر سنووردارە و بێسنور نییە.

تەنها شتە بینراوەکان دەبینێ و لە پەنهانەکان بێ ئاگایە ﴿ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ﴾ [1]، واتە: (تەنها ئاگادارن بە ڕووکەشی ژیانی دونیا و بێ ئاگان لە باسەکانی ڕۆژی دوایی).

لە جوگرافیایەکی تایبەت دەتوانێ بیردۆز دابڕێژێ، نەك بۆ هەموو جۆر و ڕەنگ و شێواز و تاکە جیاوازەکان، کاریگەری ژینگەیی و جوگرافیا و قەوم ودەوڵەمەندی و فەقیری و هێز و فاکتەرەکانی تری لەسەرە.

بەڵام وەحی لە پێش زەمان و مەکانە، پێویستی بە کەس نییە، هیچ جۆرە فاکتەرێك ناتوانێ کاری تێبکات و زانیاریەکانی بە ڕێژەی ١٠٠٪ تەواوو یەقینی و بێسنوورن، لە ئاشکرا و پەنهان ئاگادارە. بۆیە مرۆڤ لەگەڵ وەحی بە ئاسانی دەتوانێ باشترین زانیاری بەدەست بهێنێ، چاکترین چارەسەر بۆ تەواوی گرفتەکانی ژیان بدۆزێتەوە، عەقڵیش بە تێگەیشتن لە وەحی ڕێگای ڕاست و دروستی خۆی دەگرێتە بەر.

---

(١) سورەتی الروم ئایەتی ٧ .

## چۆن بینای رۆشەنبیری و مەعریفی بکەین لە ڕێگەی وەحی؟.

بینای رۆشەنبیری و مەعریفی بو تاکەکان بنچینەی کومەڵگایەکی بەهیزە ، دەروازەی گۆرانکارییە، بنەمای پێشکەوتن و داهێنانە، فراوان بوونی رۆشەنبیریە. وەحی تەواوی کتیبە ئاسمانیەکان دەگرێتەوە، قورئان کەلامی خودای پەروەردگارە، لەنێویاندا ماوەتەوەو گۆرانکاری تێدا نەکراوەو پارێزراوە ، چون بینای رۆشەنبیری و مەعریفی بەم قورئانە بکەین بێگومان دەبێ وەسفی ناوەروك و تایبەتمەندیەکانی بکەین:

١- کاتێك دەڵێین وەحی واتا قورئان و کەلامی خوای گەورە: ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾[١]. واتە: (هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواویەك ڕووی تیَ ناکات لە هیچ کاتێکدا و لە هیچ لایەکەوە, ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییە و شایەنی سوپاس و ستاییشە).

٢- قورئان حەقی ڕەهای لایە : ﴿ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾[٢]. واتە: (ڕاست ئەوەیە کە بۆت هاتووە ئەی محمد لە لایەن پەروەردگارتەوە کەواتە لە گوماندااران مەبە).

---

(١) سورەتی فصلت ئایەتی ٤٢ .

(٢) سورەتی البقرە ئایەتی ١٤٧ .

٣- تەواوی پەیرەوانی کتێبە ئاسمانییەکان دەزانن قورئان لەلای خودا دابەزیوەو حەق و ڕاستە: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ﴾ [1]. واتە: (ئەوانی کە نامەمان پێبەخشین سوور دەزانن بێگومان ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگارتەوە بە حەق و ڕاستی نێردراوە).

٤- قورئان ڕێگەی ڕاست و دروستی مەعریفی و زانستە: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾ [2]. واتە: (بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێباز و بەرنامەیەك کە ڕاسترینە).

---

(١) سورەتی الأنعام ئایەتی ١١٤ .

(٢)سورەتی الإسراء ئایەتی ٩ .

## پولین کردنی وەحی بەسەر رۆشەنبیری و مەعریفەو زانیاری

بۆ سوود وەرگرتن لە وەحی، یان چۆنیەتی بیناکردنی رۆشەنبیری و مەعریفی خۆمان لە وەحی،پێویستە بابەتەکە پۆلێن بکەین، هەندێك جار وەحی زانیاری تەواو و قەتعیت دەداتیێ، بوار بۆ مرۆڤ ناهێلێتەوە تا قسەی تێدا بکات، واتا لە سنوری توانای مرۆڤەکان نییە، جاری واش هەیە مەجال بۆ مرۆڤەکان دەهێلێتەوە تاکوو ئیجتیهادی تێدا بکەن، لە چوارچێوەی ئاماژەو لێکۆلینەوە بگەنە ئەنجام .

## بەم چەند خالە پۆلێنی سوود وەرگرتن لە وەحی دیاری دەکەین:

١- جاری وا هەیە وەحی زانیاری و مەعریفەیەکی یەقینی تەواوت دەداتیێ لەسەر بابەتێك، مرۆڤ تەنها بۆی هەیە وەری بگرێ و تێی بگا و قبوولی بکات، بێ ئەوەی پێشتر هیچ زانیاریەکی لەسەر هەبێت، واتا عەقلی مرۆڤەکان لەم جیهانە هیچ دەورێکیان نییە ناتوانن قسەی تێدا بکەن، یان وەلامی پرسیارەکانی بدەنەوە، یان بگەنە ڕاستییەك جێگای قبوول بێت، وەحی دوو جیهان لێك جودا دەکاتەوە، ناوی ناوە جیهانی پەنهان و جیهانی بینراو، ئەم زانست و مەعریفیانەی باسی جیهانی پەنهانە، مرۆڤ لێی بێ ئاگایەو مەجالی لێکۆلینەوە و بە

دواداچوونی بۆ نییە، ( ٤٨ ) جار وشەی غەیب هاتووە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: هاتووە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ ﴾ [1]. واتە: (کلیلی هەموو نهێنییەکان هەر لای خوایە و کەس نایان زانێ).

﴿ فَقُلۡ إِنَّمَا ٱلۡغَيۡبُ لِلَّهِ ﴾ [2]. واتە: (بلّێ بێگومان زانینی نهێنییەکان تایبەت بە خوایە).

تەنانەت پێغەمبەرانیش شارەزاییان نییە لە سەر جیهانی پەنهان تەنیا ئەوانەی خودا پێی فەرموون ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ ﴾ [3] . واتە: (هەر خوا زانایە بە نهێنییەکان و کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنییەکانی تەنها ئەوانە نەبێ کەخودا لێیان رازیەو زانیاریان لەبارەی غەیبەوە دەداتێ).

ئەم ئایەتانە ڕۆشەنبیری و زانیاری تەواومان پێدەدەن لە سەر جیهانی پەنهان، تەواوی پرسیارە فەلسەفیەکانی مرۆڤ دەتوانن لێرەوە وەلاّم بدەنەوە، بێگومان مروڤ ناتوانێ تەنها بە عەقلّ وەلاّمی سێ پرسیارە فەلسەفیەکەی دەست بکەوێ، تەواوی بیردوزو تیۆریەکان جگە لە وەحی ناتوانن هیچ زانیاری و زانستێك ببەخشن، یان وەلاّمێك بۆ ڕاستییەکان وەرگرن.

(١) سورەتی الأنعام ئایەتی ٥٩ .
(٢) سورەتی یونس ئایەتی ٢٠ .
(٣) سورەتی الجن ئایەتی ٢٦ .

بۆ نمونە: ژیانی دوای مردن كە پێكهاتووە لە قەبر، زیندووبونەوە، لێ پێچینەوە، پاداشت و سزا، بەهەشت، جەهەنەم ، تەواوی زانست و زانیاری پەیوەست بە ژیانی دوای مردن تەنها لە ڕێگەی وەحیەوە دەست دەكەوێت، هەموو تیۆرو بیردۆزەكان لەم بابەتە بە هەڵە داچوون نەیان توانیوە وەلاَمی راستیان دەست بكەوێ .

٢ـ هەروەها وەحی كۆمەڵێك رۆشەنبیری و زانست و زانیاری تەشریعی و ئەخلاقی دەدات بە مرۆڤەكان بۆ ڕێكخستنی ژیانیان، لە مەبادئی و فەرمانـكردن و قەدەغەكردندا، مرۆڤ بۆی نییە ئیجتیهادی تێدا بكات، تەنها لەسەریەتی جێبەجێیان بكات و قەبووڵی بكات، بۆ ڕێكخستنی جووڵەی رۆژانەی لەگەڵ خۆی و خەڵكدا، لادان لەم پێوەرە تەشریعیانە زیانی زۆر گەورە بە كۆمەڵگا دەگەیەنێ، كاریگەری نەرێنی لەسەر مرۆڤەكان دروست دەكات، چونكە وەحی هەر زانیاریەك بدات لە بارەی تەشریعەوە تەنها بەرژەوەندیە بۆ مرۆڤەكان و دورخستنەوەی خراپەیە لێیان .

٣ـ هەروەها وەحی چوارچێوەو پێوەری داناوە بۆزۆر لایەنی جیاواز، یەكێك لەوانەش مەنهەجی پەروەردەو فێركردنە، كە وەحی بە چوارچێوەیەكی قەتعی قسەی لەسەر نەكردووە بەڵكوو مەجالێكی فراوانی بە مرۆڤەكان داوە، تا باشترین ڕێگا و چاكترین شێواز هەڵبژێرین بۆ پێگەیاندن و تێگەیاندن، چ یاسا و پێوەرێك دەبێتە هۆی ئاوەدانكردنەوەو زیادبوونی زانست و مەعریفە و ڕۆشەنبیری

بەرچاوکردنی پێوەرەکان دەتوانن گەشەی پێ بدەن و کۆمەڵگای پێ سەربخەن، تا ئەمن و ئارامی و شارستانیەت بەرپا دەکەن.

## پەیوەندی وەحی بە رۆشەنبیری و مەعریفەو زانستە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ

پەیوەندی وەحی بە زانستە مرۆییەکان پەیوەندیەکی هەمەلایەنە و هەمەجۆرە، گرینگی پەیوەندی وەحی بە زانستە مرۆییەکان لەوەدایە بە هەردووکیان چارەسەری کێشەکانی مادی و مەعنەوی و ئەخلاقی و جیهانی مرۆڤ دەکەن، بۆ هەر ڕەهەندێك لەم ڕەهەندانە وەحی دەوری باڵای هەیە و یاسا و پێوەری بۆ داناوە، مرۆڤیش بە لێکدانەوە و بە دواداچوون لە وەحی زانستەکان بەفراوانی و هەمەلایەنی بەرهەم دێنێ، وەحی لە چەند ڕووێکەوە کار ئاسانی دەکات تا مرۆڤەکان بتوانن لەم چوارچێوەیە رۆشەنبیری و زانستی فراوان بەرهەم بهێنن لەوانە:

١- مرۆڤ بە بێ وەحی لە چوارچێوەی مادی ڕووت دەمێنێتەوە، ناتوانێ لە بازنەی روحانیەت و دەروون رۆشەنبیری و زانستی خۆی فراوان بکات، وەحی بەهۆی فراوانی و گشتگیری خۆی زانیاریەکی زۆر لە ڕووی ڕوحانیەت و دەروونی بە مرۆڤەکان دەدات، ئەمەش دەبێتە دەرگایەکی زانستی و مەعریفی و رۆشەنبیری فراوان بۆ مرۆڤ و زانستە مرۆییەکان، تا مرۆڤ لە جیهانی مادیەت بپەڕێتەوە بۆ هەردوو جیهان

واتە مادی و مەعنەوی، یان ڕوحی.

٢-وەحی مرۆڤەکان ئازاد دەکات لە لێکدانەوەیەکی ڕووتی مادی بۆ بونەوەرو مرۆڤ و ژیان و کۆمەڵگا، ئەم لێکدانەوەیە سەری کێشاوە بۆ بێباوەڕی و ئیلحاد، لێرەدا زانستەکانی وەحی تێروانینێکی دروست بۆ مرۆڤەکان دروست دەکەن، تاوەکو ببێتە خاوەنی زانست و مەعریفەی ڕاست بۆ ژیان و کۆمەڵگاو بونەوەرو مرۆڤ.

٣- زانستە مرۆییەکان کاریگەری ئایدۆلۆژیاو ئینتیمای کەسی و قەومیاتی لەسەرە، بۆیە لە ڕێڕەوی ڕاستی خۆی لایانداوە، بنەماکانی ڕاستی و ئەمانەت و بەرپرسیاریەتی و ڕاستگۆییە لە وەحی دا زانستە مرۆییەکان دەخاتەوە سەر ڕێگای ڕاستی رۆشەنبیری و زانستی و مەعریفەوە، ئەمەش لەژێر چەتری تەوحید و یەکتاپەرستی دەبێت.

٤- زانستە مرۆییەکان بەتەنها بەگشتی جیاکاری دەکات لەنێوان لێکۆڵینەوەی زانستی ڕووت و ڕەها، ئەمەش زۆر جار وادەکات زانستەکان ببن بە نەهامەتی و ناخۆشی بۆ مرۆڤ، بەلاّم بە پێوەری وەحی هەموو رۆشەنبیری و زانست و مەعریفەیەك گرێ دراوە بە بەهاو قیەم و ئەخلاق.

٥- هیچ زانستێکی مرۆیی نییە کاریگەری کۆمەڵگاو واقیعی لەسەر نەبێ، زۆرجاریش کۆمەڵگاو واقیع لایداوە لە ڕێڕەوی خۆی و نەگۆڕو گۆڕاوەکانی (الثوابت والمتغيرات)ی تێکەڵ کردووە، بەم جۆرە کۆمەڵگایەکی خراپ و فاسد بەرهەم دێت، لە بری کۆمەڵگایەکی

تەندروست و ساغ، بەڵاّم پێوەری نیگا دادگەری و حەق و ڕاستی دەبێتە پێوەرو میزان بۆ هەڵسەنگاندنی تەواوی رۆشەنبیری و زانست و مەعریفە مرۆییەکان.

## زانیاری رۆشەنبیری و مەعریفی لەوەحی دا

وەحی کۆمەڵێك رۆشەنبیری و زانیاری ورد دەدات بە مرۆڤ لە زۆر لایەنەوە، کەمرۆڤ لێیان بێ ئاگایەو ناتوانێ بەبێ وەحی ئەم رۆشەنبیری و زانستانە بەدەست بهێنێ لەوانە :

## یەکەم: رۆشەنبیری سەرەتای بونەوەرو ژیان.

وەحی رۆشەنبیری و زانستێکی وردی مێژوویی لە بارەی مرۆڤەکانەوە دەدات لەبارەی سەرەتای دروستبوونی مروڤەکان و هەروەها داهاتوویان ، ئەم زانست و مەعریفەیە کەوەحی دەیدات تەواو راست وحەتمیە و هیچ گومان هەڵناگرێ، سەرچاوەی رۆشەنبیری و زانستەکەش خودای گەورەیە پێمان دەڵێ چی ڕوویداوە، چ ڕوودەدات لە ڕابردوو لە داهاتوودا وەك:

﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٍۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾[1]. واتە: (سوێند بە خوا ئەوەی کردوویانە بۆیان دەگێڕینەوە، ئێمە هیچ بێ ئاگا نەبووین لێیان).

﴿ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلۡقُرُونِ ٱلۡأُولَىٰ قَالَ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٍۖ لَّا

(١) سوڕەتی الأعراف ئایەتی ٧ .

يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴾[1]. واته: (فیرعەون وتی ئەی خەڵکانی پێشوو حاڵیان چۆنه, موسا فەرمووی زانیاری ئەوه لای پەروەردگارمه له پەڕاوێكدا و هیچی لێ ون نابێ و هیچی له بیر ناچێ).

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴾[2]. واته: (ئەوەی باسكراوه بۆت چەند هەواڵێك له شارەكانی پێشوو ئێمه بۆت دەگێڕینەوه هەندێكیان ماون و هەندێكیان نەماون).

﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ ﴾[3]. واته: (هەمووت بۆ دەگێڕینەوه له هەواڵی پێغەمبەران).

﴿ كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴾[4]. واته: (ئەی محمد بەو جۆره بەسەرهاتی گەلانی ڕابردووت بۆ دەگێڕینەوه, بێگومان له لایەن ئێمەوه قورئانت پێدراوه).

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانه وەحی سەرچاوەیەكی ڕۆشەنبیری و زانستی و مەعریفی زۆر گرنگه لەڕووی مێژووییەوه، بۆ پەرەپێدانی زانسته مرۆییەكان له ڕووی سیاسی و فەرهەنگی و كۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و فێركردن و ئەخلاقی نابێ تاكی موسلمان لێی بێ ئاگا بێ.

---

(١) سوڕەتی طه ئایەتی ٥١ - ٥٢ .
(٢) سوڕەتی هود ئایەتی ١٠٠ .
(٣) سوڕەتی هود ئایەتی ١٢٠ .
(٤) سوڕەتی طه ئایەتی ٩٩ .

- **لەبارەی رۆشەنبیری و وشیارییەوە:**

**(المؤمن فطن كيس حذر)** واتە:موسلمان ژیرە،رۆشەنبیرە ، ئاگادارە.

- **لەبارەی پلانی دوژمنان: (لايلدغ المؤمن فی جحر مرتين)**

واتە: ئیماندار ئەوەندە رۆشەنبیرە لەکونێکەوە دو جار پێوە نادریت.

ئەمانەو چەندان بابەتی تر لەبارەی ڕۆژی دوایی و نیشانەکانی و باسی بەهەشت و جەهەننەم و تەواوی رۆشەنبیری و زانست و زانیاری و مەعریفە لە سوننەدا هاتووە، لەبەر درێژی بەوەندە کۆتایمان پێ هێنا.

## رۆشەنبیری و زانیاری و زانست و مەعریفە مرۆییەکان لەنێو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

رۆشەنبیری و زانیاری و زانستێکی بێ ژومار هەیە لەسەر زانستە مرۆییەکان، هەر پسپۆرییەك لە زانستی خۆی دەتوانێ لەم کانیاوە پاکە رۆشەنبیری و مەعریفەی خۆی زیاد بکات و زانستی خۆی پەرە پێ بدات بە زانستە جیاوازەکانیشەوە، لێرەدا بۆ هەر بەش و بابەت و زانستێکی جیاواز نمونەیەك دێنینەوە.

رۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لەبارەی پەروەردەو ئاداب:

**(كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِبًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ)**[1] واتە: بەسە بۆ مرۆڤ درۆکردن کە هەرچی بیستی بیلێتەوە.

---

(١) موسلم گێڕاویەتیەوە (١٠/١ ، ژ ٥) .

- ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لە بارەی ژینگەوە:

**(لا يبولن أحدكم في الماء الدائم ولا يغتسل فيه من الجنابة)**[1].

واتە: پیسایی لە ئاوێکدا مەکەن کە وەستاوە و خۆشتانی تێدا مەشۆن.

- ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لە بارەی دارو درەختەوە:

**(مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا، فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ، إِلَّا كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ)**[2] واتە: هەر موسوڵمانێك شتێك بچێنێت باڵندەیەك لێی بخوات یان مرۆڤێك یان ئاژەڵێك بە خێر و چاکە بۆی دەنووسرێت.

- ڕۆشەنبیری و زانست ومەعریفە لە بارەی بەروبومی گیانداران:

**(مَنْ قَتَلَ عُصْفُوراً بِغَيْرِ حَقِّهِ، سَأَلَهُ اللَّهُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**[3] واتە: هەرکەسێك باڵندەیەك بکوژێت بە تاوانباری خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات.

- ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لە بارەی تەندروستی و چارەسەرەوە: **(نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالفَرَاغُ)**[4] واتە: دوو نیعمەت هەیە خەڵکێکی زۆر تێیدا بێ بەشن, تەندروستی و کات بەتاڵی.

---

(١) ئەبو داود گێڕاویەتیەوە (١/١٨ ، ژ٧٠) ، هەروا ابن حبان (٤/٦٨ ، ژ ١٢٥٧) .

(٢)موسلم گێڕاویەتیەوە (٣/١١٨٩ ژ١٥٥٣) .

(٣) بەیهەقی لە شعب الإيمان گێڕاویەتیەوە (٧/٤٨٣ ، ژ ١١٠٧٥) هەروەها أحمد (٢/١٩٧ ، ژ ٦٨٦١).

(٤) بوخاری گێڕاویەتیەوە لە صەحیحەکەیدا (٥/٢٣٥٧ ، ژ ٦٠٤٩) .

- ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لە بارەی پاك و خاوێنی:

جگە لەوەی چەندان جۆر خۆ شۆردنمان هەیە زۆریان لە سوننەت دا باس کراون، کەچی پاك و خاوێنی بە نیوەی ئیمان دادەندرێت: **(الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ)**[١] واتە: پاکوخاوێنی نیوەی ئیمانە.

- ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لە بارەی ئابورییەوە:

**(مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا، فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ، إِلَّا كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ)**[٢] واتە: هەر موسوڵمانێك شتێك بچێنێت باڵندەیەك لێی بخوات یان مرۆڤێك یان ئاژەڵێك بە خێر و چاکە بۆی دەنوسرێت.

- ڕۆشەنبیری وزانست ومەعریفە لەبارەی ئەزموونی مرۆڤەکان:

- بە نمونە فێربوونی زمان: قال زید: (امرنی رسول الله فتعلمن له کتاب یهود بالسریانیة)[٣]. واتە: زەید دەفەرمویت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پیّ کردم فێری زمانی یەهودیەکان بوم). **(الحکمة ضالة المومن انی و جدها فهو حق بها)** [٤]. واتە: دانایی بزربووی ئیماندارانە لەهەر شوێنێك دۆزیەوە ئەو لەهەموو کەس حەقترە دەستی پێوە بگریّ.

- ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لەبارەی مێژووەوە:

---

(١) موسلم گێڕاویەتیەوە (٢٠٣/١، ژ ٢٢٣) .
(٢) موسلم گێڕاویەتیەوە (١١٨٩/٣ ژ١٥٥٣) .
(٣) بوخاری گێڕاویەتیەوە لە صەحیحەکەیدا لە (باب ترجمة الحکام ١٣ / ١٦١ ) .
(٤) ابن ماجه گێڕاویەتیەوە لە (کتاب الزهد باب الحکمة ژ ٤١ ٩) کنز العمال: (ب٠/ل٠ ژ٤٤٠٨٩)

تەواوی ڕووداوەکانی جەزیرەی عەرەب و بەشێکی فارس و ڕۆم و حەبەشە لە ڕووی مێژووەوە لە سوننەتدا باس کراوە وەك سەرچاوەی رۆشەنبیری وزانست و مەعریفە، جگە لەمانە هەر بابەتێك دەتەوێ زانیاری لەسەر کۆبکەیتەوە ئەوە سەرچاوەی دووەم کە سوننەتە قسەو باسی تێرو تەسەلی لەسەر کردووە، بۆیە تاکی موسلمان نابێ بێ ئاگا بێت لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ گەشەی زانست و زانیاری و مەعریفە.

ئەمەی کە لێرەدا باسمان کرد دلۆپە ئاوێکە لە بەحرێکی بێ بنی سوننەت[1].

(١) بڕوانە: السنة مصدر للمعرفة و الحضارة ، د. يوسف القرضاوی، ( ٨٤ — ١٢٥) .

## کەلەپوری ئیسلامی سەرچاوەی ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفە

بەشێکی زۆر لەئوممەتان خاوەن کەلەپورێکی زۆرن، ئەم کەلەپورە بۆ هەر ئومەتێك بۆتە ڕەگ و ڕیشە لە ڕووی مێژوویی شارستانیەتەوە، بۆیە تەواوی ئومەتان هەوڵیان داوە ئەم کەلەپورە بپارێزن و وەك سەرچاوەیەکی ڕۆشەنبیری و شارستانی و زانستی و مەعریفە بەکاری بهێنن, بەڵام هیچ کەلەپوورێك ناتوانێ خۆی لە قەرەی کەلەپووری سێزدە سەدەی ئیسلامی بدات، لەگەڵ ئەوەی بەشێکی تێبینی لەسەرە و کەموکوڕی هەیە, بەڵام چونکە ئەمانەت و ئەخلاق دوو بنچینەی سەرەکین بۆ گواستنەوەی زانیاری لەتەواوی کەلەپووری ئیسلامی وای کردووە ئەم کەلەپوورە لەم کەموکوڕی و لادانە زۆرە بپارێزرێ ، جگە لەوەش کەلەپووری ئیسلامی سەرچاوەی لە قورئان و سوونnەتی صحیحی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵێنجاوە, تەواوی لایەنەکانی ژیانی گرتۆتەوە، وەك کەلەپوورەکانی تر گرنگی بەچەند لایەنەك نەداوە و ئەوانی تر پشتگوێ بخات, بۆ نمونە کەلەپووری ئیسلامی پڕە لە ڕۆشەنبیری و زانست و مەعریفەی سیاسی و فکری و پەروەردەیی و فەلەکی و کۆمەڵایەتی ...هتد. ئەمەش سەروەتێکی یەکجار گەورەی بۆ دوای خۆی جێ هێشتووە، بۆتە شوناس و ناسنامەی ئوممەی ئیسلامی. پاراستنی ئەم شوناسە بۆ موسوڵمانان مانەوەی ڕۆشەنبیری و مەعریفە و زانستە لە کەلەپوری ئیسلامی.

## کەلەپوور (التراث) مانای چیە؟

کەلەپور بە مانا فراوانەکەی بەهەموو ئەوانە دەوترێت لە بنچینەدا بۆ نەوەی دوای خۆی بە جێ بهێڵێت لە بەرهەمی فکری و ئەدەبی و شارستانیەتی و ماددی و مەعنەوی.

وشەی کەلەپور (**التراث**) لە زمانەوانیدا ئەوەیە کە مرۆڤ لە دوای خۆیدا بەجێی دەهێڵێ وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ﴾[1]. واتە: (خوایە لە لایەن خۆتەوە کەسێکم پێ ببەخشە, ببێتە میراتگری من و بنەماڵەی یەعقوب و خوایە بیکەیتە کەسێکی ڕەزامەند).

هەروەها: ﴿ وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا ﴾[2]. واتە: (میرات دەخۆن بە بێ بەهایی و بە سانایی).

هەروەها: ﴿ وَوَرِثَ سُلَيۡمَٰنُ دَاوُۥدَۖ ﴾[3] . واتە: (سولەیمان بوو بە میراتگری داود).

لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتووە کەلەپور بە زانستی پێغەمبەران لێکدراوەتەوە، کە زانستێکی خوداییە لە ڕێگەی

---

(١) سوڕەتی مریم ئایەتی ٥ - ٦ .
(٢)سوڕەتی الفجر ئایەتی ١٩.
(٣)سوڕەتی النمل ئایەتی ١٦ .

وەحیــیەوە بۆ پێغەمبەران هاتووە، دواتر لەوانەوە وەك میرات بۆ زانایان بەجێ ماوە **(وَإِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، وَإِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا، وَلَا دِرْهَمًا وَرَّثُوا الْعِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ)**[1]

واتە: (بەڕاستی زانایان میراتگری پێغەمبەرانن ، بەڕاستی پێغەمبەران دینارو دەرهەمیان بەجێ نەهێشتووە لەدوای خۆیان، بەڵکو زانستیان بەجێ هێشتوە، هەر کەسێك پشك و بەشی بەر بکەوێ پشك و بەشی بێ شوماری بەرکەوتووە).

- ابن القيم دەفەرموێت واتای ئەم فەرموودەیە: (إن العلماء ورثة الأنبياء" هذا من أعظم المناقب لأهل العلم فإن الأنبياء خير خلق الله، فورثتهم خير الخلق بعدهم)[2].

واتە: (دانانی زانایان بە میراتگری پێغەمبەران لە گەورەترین پلەی ئەهلی زانستە، بەڕاستی پێغەمبەران باشترین دروستکراوی خوان میراتگرەکانیشیان باشترین دروستــکراوی دوای ئەوانن).

- هەروەها لە بەسەرهاتی ئەبوهورەیرە ڕەزای خودای لێبی، کاتێ بەلای بازاڕو بازرگانەکان دا تێپەڕی فەرمووی ئێوە چی دەکەن لێرە لە کاتێکدا وا لە مزگەوت میراتی پێغەمبەری خودا دابەش دەکرێت، هەستان ڕۆیشتن بەپەلە بۆ مزگەوت هیچیان نەبینی تەنها

---

(١) أبو داود گێڕاویەتیەوە (٣١٧/٣) ژ(٣٦٤١) ، ترمـذي (٤٨/٥) ژ(٢٦٨٢) ، ابـن ماجـه (٨١/١) ژ(٢٢٣) .

(٢) بڕوانە: مفتاح دار السعادة (٦٦/١) .

قورئان و سوننەت و زیكرو زانست نەبێ، وتیان كوا ئەوەی وتت ئەی ئەبا هورەیرە فەرمووی: ئەمە میراتی پێغەمبەری خودایە لە نێوان بەش وەرگرەكان دابەش دەكرێت(١).

- هەندێك جار وەحیش بە كەلەپوور لێكدراوەتەوە خودای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ ﴾(٢). واتە: (لە پاشان ئەم قورئانەمان دا بە كەسانێك و هەڵمان بژاردن).

- **دكتۆر موحسین عبدالحمید:** پێناسەی كەلەپور بەمشێوەیە دەكات: (كەلەپور بەروبوومی شارستانیەتە ، كە دەرهاوێشتەی تایبەتمەندی ئومەتێكە لەو ئومەتانەی كە لەگەڵ ژینگە تێكەڵ بوون و كارلێك دەكەن، تێیدا سەریان هەڵداوە، بە هەموو ئەو ڕوداوو ئەزموونانەی كە لەخۆی دەگرێ بەشێوازێكی تایبەت ڕەنگی دەكات، تا شارستانیەت و ڕۆشنبیری و هەڵسوكەوت و عادات و تەقالیدی ژیانیان بەم ڕەنگە جیادەكاتەوە لە ئومەتانی تر)(٣).

- **دكتۆر ئەكرەم العمری:** بەشێوازێكی تر پێناسەی كەلەپوور دەكات نزیك لەم بابەتەی ئێمە مەبەستمانە دەڵێت: (كەلەپوور ئەم میراتەیە، كە لە باوك و باپیرانمانەوە بۆ ئیمە بەجێ ماوە، لە عەقیدە و ڕۆشەنبیری و بەها و ئاداب و هونەر و پیشەسازی و تەواوی

(١) طبراني گێڕاویەتیەوە لە المعجم الأوسط (٢/١١٥).
(٢) سورەتی فاطر ئایەتی ٣٢.
(٣) بڕوانە: تجدید الفكر الاسلامی د. محسن عبدالحمید (ل٢٦) .

وەدەستـهاتووەکانی بەرهەمی مروڤەکان لە مادی و مەعنەویەوە، هەروەها شمولی وەحی خودایی و (قورئان و سونەت) دەکات لە پێشان بۆمان بەجێ ماوە)[1].

لێرەدا دەبێ وردبین، جیاوازییەك بکەین لەنێوان بە کەلەپور دانانی قورئان و سوننەت لەگەڵ زادەی مرۆڤ، لە لای عەلمانییەکان هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان کەلەپورەکان زادەی بەشەری بێت یان دینی، هەمووی بە کەلەپور لێك دەدەنەوە، بەلاّم لە لای ئێمەی موسوڵمان قورئان وسوننەت ئەگەر بە کەلەپووریش لێکدرابێتەوە ناکرێت هاوتای بکەی لەگەڵ بەرهەمی مرۆڤەکان، قورئان وسوننەتی تەواوی پێغەمبەر (ﷺ) قابیلی هەڵەو دەستکاری نییە، بەلاّم کەلەپوری مرۆڤایەتی با بەرهەمی موسوڵمانانیش بێت هەر هەڵەو کەم وکوڕی تێدایە.

کەواتە زاراوەی کەلەپووری ئیسلامی بەکاردێت بۆ تەواوی بەرهەمەکانی مرۆڤایەتی لە رۆشەنبیری و شارستانیەت و زانست و زانیاری و مەعریفەو گەشەپێدانی مرۆیی کە مرۆڤەکان بەرهەمیان هێناوە، ئەوەی موسوڵمانان بەجێیان هێشتووە لە زانست و زانیاری لە تەواوی دونیا بە جیاوازی زمان و ڕەگەز جوگرافیا پێی دەڵێن کەلەپوور.

کەلەپوری ئیسلامی کورت نەکراوەتەوە لە تەفسیر و حەدیس و فقە

---

(١) بڕوانە: القران والمعاصرة د. اكرام ضياْء العمرى (ل٢٧) .

و زمان ، زانست و مەعریفەی كیمیاییی جابری كوری حیان و بیركاری خوارزمی و پزیشكی و سەیدەلیەی ئیبن سینا و رازی ، جوگرافیای ادریسی و مەقدیسی، نووسراوەكانی فیردەوسی و جەلالدینی ڕومی و ئیبن عەرەبی و با فارسیش بن، ئیبن كەمال پاشا و ئیشق پاشا با توركش بن، ئیبن صلاحی شارەزوری و ئیبن خەلدون با كوردیش بن ، هەموویان لە كەلەپوری ئیسلامی دەژمێردرێن. بە بەرهەمەكانی كیشوەری ئاسیاو ئەندەلوس و فارس و ئەفریقیا و سۆڤیەتیشەوە.

## گرنگى كەلەپوورى ئیسلامى

لە قۆناغى دواى نەمانى خەلافەتى ئیسلامى شەپۆلێكى بەهێز لەلایەن عەلمانیەكانەوە دەستى پێكرد بەرامبەر بە كەلەپوورى ئیسلامى و مسوڵمانان! كاریگەریەكى نەرێنى لەسەر كەلەپوورى ئیسلامى دروست كرد، هەروەها بەشێكیش لە مسوڵمانان كەوتنە نێو ئەم شەپۆڵە و بانگەشایان بۆ دەكرد تا واى لێ هاتووە بەشێك لە خەلكى موسلمان واتێ بگەن مێژووى كەلەپوورى ئیسلامى نەهامەتى و جەهالەت و خراپەكارییە و هیچ سودێكى بۆ ئەم سەردەمە نییە و لەكاركەوتووە، ئەمەش واى كرد تاك ئاوڕ لەم هەموو كەلەپوورە زێڕینە نەداوەتەوە پشتى تێ بكات و بە نەرێنى باسى بكات، هەر ئومەت و میللەتێك خۆى لە مێژووى كەلەپورى خۆى دابڕێ خۆى لە رۆشەنبیرى و شارستانیەت و مێژووى خۆى دابڕیوە، واتە ئومەتێكى بێ سەروەرى شارستانیەتە و جێ پەنجەى لە زانست و مەعریفەدا نەبووە و شارستانیەت و ئاوەدانـكردنەوەى بینا نەكردوە، خزمەتى مرۆڤایەتى نەكردووە، ئەمەش تەنها بۆ ئەوەیە مێژووى پڕ لە سەروەرى كەلەپوورى ئیسلامى بشێوێنن، بۆیە گرنگى بە پاراستنى كەلەپوورى ئیسلامى گرنگى دانە بەپەرەپێدانى (١٣) سەدەى زێڕینى مسوڵمانان لە بوارەكانى حوكم و سیاسەت و فكرو فەلسەفەو رۆشەنبیرى و زمان و

پەروەردە و فێرکردن و پزیشکی و ئەندازیاری و بیرکاری و تەواوی بەشەکانی تری ژیان، پشتکردن لەم هەموو بەرهەم و داهێنانە پشتـکردنە لە هەوڵ و کۆششی زانایانی ئیسلامی و بەرهەمە چاپ کراو زانستە تەجروبە کراوەکانیان.

کەلەپووری میللەتان لەگەڵ ئەوەی پڕە لە هەڵەو کەم و کوڕی کەچی گرینگیەکی یەکجار زۆری پێدەدەن و دەیپارێزن، تێکەڵەیەکی زۆر هەیە لە کەلەپووری ئەوان لەگەڵ میللەتانی جیاواز و خاوەن ئایدیای جیاواز، کەچی کەلەپووری ئیسلامی لەژێر پێوەری ئەخلاقی و زانستیـدا بەرهەم هاتووە و نووسراوەتەوە.

قورئان و سونەتی صەحیحی پێغەمبەر(ﷺ) پێوەری بۆ داناوە، لەژێر بیرو باوەڕی یەکتاپەرستی و بڕوابوون بە پاداشت و سزا بەرهەم هاتووە، بۆ هەر هەوڵ و کۆشش و نووسین و داهێنانێك چاویان لەپاداشت بووە، ترساون لە سزا، ئەمەش گەورەترین پێوەرە بۆ جیاکردنەوە و گرینگی دانی کەلەپوری ئیسلامی و کەلەپووری میللەتانی تر، بۆیە تاك دەبێ زۆر گرینگی بەم کەلەپوورە بدات و بە پێوەری ورد سودی لێ وەرگرێ.

## پێوەر و بنەماكانى هەڵسەنگاندنى كەلەپوورى ئیسلامى

بۆ ئەوەى هەڵسوكەوتێكى تەندروست لەگەڵ كەلەپوورى ئیسلامى دا بكەین، باش و خراپ، ڕاست و ناڕاست لێك جیا بكەینەوە، مادام ئێمە بەدواى رۆشەنبیرى و زانستێكى تەندروست و مەعریفەیەكى گشتگیردا دەگەڕێن ، پێویستمان بە چەند پێوەرێك هەیە بۆ هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ كەلەپوور و هەڵێنجاندنى لایەنە باشەكانیەوە لەوانە:

**١ ـ پشكنین لە ڕاستى و دروستى بابەتەكە:**

وتە و نووسراوێكى زۆر لە كەلەپوورى ئیسلامى هەیە و دراوەتە پاڵ پێشینانمان بێ ئەوەى پشكنینى بۆ بكرێت، زانایانى پێشوو بۆ ڕاست و دروستى هەر وتەیەك پێوەریان داناوە تا سەنەدى وتەكان بدۆزێتەوە، بەم پێوەرە دینى ئێمە لەهەموو دین و ئایدولۆژیاكانى تر جیاوازە، هیچ قسەیەك وەرناگیرێ تابەڵگە و سەنەدى تەواوى نەبى، بۆیە كەلەپوریش دەبێ پشكنینى بۆ بكرێ تابگەیتە ئەنجامێكى دروستى زانستى و مەعریفى.

**٢ ـ مافى هەموو تاكێكى شارەزایە ڕەخنەو تێبینى هەبێ لەسەر كەلەپورى وتەى پێشینان :** تەواوى زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن

تەنها پێغەمبەران بێتاوانن، لە خوار ئەوانەوە دەکرێ هەڵە بکات.

وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: **(كل بني ادم خطاء)**[(١)]. واتە هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، هەروەها لە خوار پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەکرێ قسەی ڕەت بکرێتەوە! وەك ئیمامی مالیك دەفەرموێت: (كل احد يؤخذ من قوله ويترك الا صاحب هذا القبر)[(٢)]. واتە: هەموو کەسێك دەکرێ قسەکەی ڕەت بکرێتەوە، یان وەربگیرێ، تەنها ئەم خاوەن قەبرە نەبێ مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ)ە.

**٣ ـ دەستگرتن بە بنەمای دڵپاکی و نیازپاکی (ویژدان) لەکاتی ڕەخنەگرتن لەکەلەپووری ئیسلامی:**

نیاز پاکی بنەمایەکی قورئانییە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ ﴾[(٣)].

واتە: (ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! هەمیشە و بەردەوام هەوڵ بدەن، کە لەبەر خوا دادگەر و ڕاست و پابەندی گشت بڕیارو فەرمانەکانی بن بە دادگەرانە شایەتی بدەن و، بەلای هیچ لایەکدا مەبرن، تەنانەتی

(١) دارمی لە سوننەکەیدا گێڕاویەتیەوە (٣٩٢/٢) ژ( ٢٧٢٧) وە حاکم لە مستدرك گێڕاویەتیەوە (٢٧٢/٤) ژ(٧٦١٧)

(٢) بڕوانە: الموطأ لابن مالك.

(٣) سورەتی المائدە ئایەتی ٨ .

منداڵەکانیشتان، خەشم وقین و دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەك واتان لێ نەکات بەعەداڵەت رەفتار نەکەن دەبێ لەگەڵ مەردوم دادگەر بن، چونکە بێگومان رەفتاری دادگەریی و یەکسانی بە تەقواوە نزیکترەو پارێزگاری سنوورەکانی خوای پێدەکرێت).

لەکاتی ڕەخنەگرتن لە کەلەپووری ئیسلامی پێویستمان بەوەیە زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی نەکەین، هەروەها دەمارگیری و لایەنگریکردن بنەمایەکی هەڵەیە و نابێ بەکار بهێندرێ، بۆ ئەوی زانست و مەعریفەیەکی تەندروست بەرهەم بهێندرێت[1].

ئیبن القیم: لەم بارەیەوە وتەیەکی جوانی هەیە دەفەرموێت: (الطائفة الثالثة: وهم اهل العدل والانصاف الذین اعطى کل ذی حق حقة، وانزلو کل ذی منزلة منزلته، فلم یحکموا لصحیح بحکم السقیم المعلول، ولا للمعلول السقیم بحکم صحیح بل قبلوا ما یقبل، وردوا مایرد)[2].

(واتە تائیفەی سێیەم: ئەهلی عەدالەت و نیاز پاکن، بەشێوەیەك حەقی هەموو خاوەن حەقێك دەدەن، هەروەها هەر خاوەن پێگەیەك لە شوێن پێگەی خۆی دادەنێت، بڕیار لەسەر ڕاستی نادات لەسەر پێوەری نادروست و دەردەدارێك، هەروەها بڕیار لەسەر ناڕاستیەك نادات

---

(١) بڕوانە: الهویة والمرجعیة الاسلامیة واثارهما فی الدستور، سالم عبدالسلام الشیخی (ل ٧٠).

(٢) بروانە: مدارج السالکین لابن القیم، (٢-٤٠).

بەپێوەرە ڕاستییەکان، بەڵکو ئەوانە قبووڵ دەکەن کە قبولڵ کراون، ئەوانەش ڕەت دەکەنەوە، کە ڕەتکراونەتەوە).

## چۆن کەلەپووری ئیسلامی بکەینە سەرچاوەی ڕۆشەنبیری و زانستی و مەعریفە؟

تاك کاتێك دەیەوێت کەلەپووری ئیسلامی بکاتە سەرچاوەی ڕۆشەنبیری و زانست ومەعریفە،دەبێ کەلەپووری ڕەسەن و هاوردە لێك جیابکاتەوە، ئەم کەلەپوورەی لەگەڵ ئەصڵی ئیسلام و ڕوحی دا دێتەوەو گونجاوە، لەگەڵ ئەوەی هاوردەو خورافیاتە، تێك دەگیرێ لەگەڵ ئیسلام و عەقڵ و مەنتق و لۆژیك و زانست. بەم تێڕوانینە وشیارانە کەلەپوور هەڵدەسەنگێنی نابێ بەچاوی پیرۆزی و بێ هەڵە و پەڵە تەماشای کەلەپوور بکرێت، بەڵکوو بە چاوی وردەکاری و پشکنین و جیاکردنەوە و هەڵێنجان تەماشا بکرێ، هەموو ئەو کەلەپوورانەی هەیە مەرج نییە لەسەر ئیسلام حیساب بێت و تەواو ڕاست بێ، زۆر کەلەپوور هەیە هەڵە و ناڕاستە، دەبێ پشتگوێ بخرێت و نابێتە سەرچاوەی زانست و مەعریفە بۆ تاکەکانی گومەلگا.

لەو ڕەخنانەی لە بەشێك لە کەسایەتی ئیسلامی و پەرتووك و مامۆستایانی ئایینی دەگیرێ ئەوەیە بەبێ هەڵێنجاندن و جیاکردنەوە، و بەبێ پشکنین کەلەپوور نەقڵ دەکەن ، یان هەندێ جار وەك دەقی قورئان و فەرموودەی صەحیح مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، دواتر ئەمە چونکە بەرهەمی مرۆڤە هەڵە دەردەچێ خەڵك بەچاوی دەق تێی

گەیشتووە، کاتێك لەگەڵ زانست یان واقع نایەتەوە واتێدەگەن کەئەم دینە ناتوانێ لەگەڵ واقیع هەڵبکات، لەگەڵ زانست تێك دەگیرێ، بە تایبەتی ئەوانەی قسەو لێکدانەوەی زانایان وەك دەق تەماشادەکەن، یان لە کاری سیاسی حیزب وگرووپەکان حوکمی پێ دەکەن،وا لە خەڵك دەگەیەنن ئەمە دەقە وافەرمان دەکا نەك قسە وتێگەیشتنی زانایەکە بە تایبەتی تر لە بابەتی تەکفیرکردن و سنوور (الحدود)، بەشەکانی تر.

بەشێك لە کەلەپووری ئیسلامی سۆفیگەری ناتەندروست و ئەهلی کەلام و حوکمی بنەماڵە و ستەم و بابەتی فۆلکلۆری و فەلسەفەی ناتەندروست و نیقاشی بێسود بووە! ئەمانە گەرچی کەلەپوری ئیسلامیشن بەڵام وەك سەرچاوەی زانست و مەعریفی ناژمێردرێن، دەبێ تاکی ژیر خۆی لەمانە بپارێزێ، کەلەپووری ئیسلامی ئەوەندەی پاك و چاك تێدایە پێویست بە خوڕافیات و ئەفسانەو لاری ناکات بیکەیتە سەرچاوەی رۆشەنبیری و زانست و مەعریفەی خۆت.

لەلایەکی ترەوە لە سێزدە سەدەی ڕابردوو هەزاران گرفت ڕووی لە جیهانی ئیسلامی و موسڵمانان کردووە، سوڵتان و زانایان بەپێی تێگەیشتنی سەردەمی خۆیان چارەسەریان بۆ دۆزیوەتەوە بۆ زەمەن و کات و شوێنی خۆی، ئەمە بۆتە کەلەپور لەوانەیە نەگونجێ بۆ سەردەمی ئێستا، یان لەگەڵ پێشکەوتن و شارستانیەتی ئێستا و گرفتەکان گۆرانکارییان بە سەردا هاتووە، ناکرێت بەپێوەری سەدەکانی پێشوو هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەمرۆ بکەی. زانایان خودا پاداشتیان بداتەوە لە هەموو بوارێك زانستیان جێ هێشتووە، بەڵام مەرج نییە

مەرج و پێوەرەکانیان بۆ ئەم سەردەم و کات و شوێنە گونجاو بێت، بۆیە تاکی رۆشەنبیر دەبێت زۆر بە هەستیاریەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەلەپووری ئیسلامی دابکات وەك سەرچاوەی زانست و مەعریفە بە کاری بێنێ،بەلاٚم بەو زانیاری و وشیاری و وردبینیەی لەپێشدا باسکرا.

## هەمەچەشنی رۆشەنبیری و زانست و مەعریفە لە کەلەپووری ئیسلامی دا

زانایان گرنگیەکی زۆریان بە تەواوی زانستەکان داوە، لە تەواوی بابەتەکانیان نوسیووە، هەموو بابەتەکانی رۆشەنبیری و شارستانی و زانستی و مێژوویی و دینی و کۆمەلاٚیەتی و شیعر و پەخشان و زمان و فەلسەفە و فیکر و فەرهەنگ و بابەتەکانی زانستی مرۆیی و تەنانەت پزیشکی و ئەندازیاری و فەلەکیشی گرتۆتەوە، ئەمانە بووەتە سەروەتێکی گەورەی کەلەپوری ئیسلامی بۆ ئێمە، بۆ هەر فەترەیەکی زەمەنی ناوی تەواوی نووسەر و کتێبەکان و جۆری بابەتە زانستی و مەعریفیەکەش نوسراوەتەوە، تا تاکی رۆشەنبیر بزانێ بەرهەمە مەعریفیەکان چین ، بۆ نموونە (محمد بن اسحاق الندیم) کتێبێکی لەم جۆرە داناوە بەناوی (الفهرست) تا سەدەی چوارەمی هێناوە، تێیدا تەواوی بەرهەمەکانی باس کردووە، لە بارەی زمانی میللەتان، شەریعەتی دابەزێندراو، ( رێساکانی نحو ، صرف) ، هەواڵ و ئادابەکان فیقە وفوقەها ، سیرە و نەسەب، فەرمودەناسی و فەلسەفە ، موسیقا

و هونەر ، بیرکاری، سیحر و کەهانە ، مەزهەب و عەقائید ، کیمیاو فەلەك ، بابەتەکانی تر، چەندان کتێبی تر لەم جۆرە زورترین زانیاری لەسەر کەلەپووری ئیسلامی تێیدا کۆکراوەتەوە.

## سەرچاوە کانی تری رۆشەنبیرو

## مەعریفە و زانست

سەرچاوەکانی زانست و مەعریفە جگە لەبوارە نەقلیەکان کە قورئان و سونەتی صحیحی پیغەمبەرە (ﷺ)، دواتر کەلەپوری موسڵمانان بەشێکی گەورەیە لەسەرچاوەی پەیداکردنی زانست و زانیاری و مەعریفە، لەدوای ئەوانە ئەندامە هەستیارەکان دین وەك عەقڵ و دڵ و هەستیارەکانی تر، عەقڵیش بەکۆمەلێك شێواز لێکدراوەتەوە، بەنموونە:

١- عەقڵ ئەم بەخششە خوداییەیە کە دراوەتە پاڵ مروڤ، مروڤی لە بوونەوەرەکانی تر جیاکردۆتەوە.

٢- هەروەها عەقڵ بەمانای مەعریفە و زانیاری فیتری و زانستیە زەروورییەکان دێت بو هەموو عاقڵمەندان وەك بلێی ( ژمارە یەك نیوەی ژمارە دووە).

٣- هەروەها عەقڵ بەکارهاتووە بەمانای زانستە تیۆریەکان کە بە ڕێگەی بەلگە و دەلیل بەدەست دێت.

٤- هەروەها عەقڵ بەکار هاتووە بەمانای کارکردن بەپێوەری زانستی، ئەمەیان بووەتە هۆکار بۆ چوونە نێو جەهەنەمی کافران، وەك

خوداى گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾[1].

کەواتە عـەقلْ دەورێکى زور گرنگى هەیە لەوەدەستـهینانى ڕۆشەنبیرى و زانست و زانیارى و مـەعریفە، لە خوارەوەش بەکورتى ئاماژە بەعـەقلْ ودلْ و هەستیارەکان دەکەین .

## یەکەم:عـەقلْ.

عـەقلْ ئەم بەخششە خودایییە، کە مرۆڤـ لەسەرجەم بونەوەرەکانى دیکەجیادەکاتەوە، بەهۆى عـەقلەوەمرۆڤ لە دروستکراوە سەرپشکەکانە بەهۆى عـەقلەوە سەرجەم دروستکراوەکانى دونیا بۆى ڕام کراوە و ئەو سەردار و بەڕێوەبەریانە، لەگەلْ بەشەکانى تریشەوە لە لاشەى خۆى پەیوەندییەکى زۆر بەهێز هەیە لەنێوانیان، هەر عـەقلە ڕاستى و ناڕاستى لەیەك جیادەکاتەوە، دلْ ڕووناك دەکاتەوە، زانیارى ڕاستەقینە کۆدەکاتەوە، فکرى ئیسلامى لەسەر بینا دەکات.

بۆیە ئیمامى جورجانى زۆر جوان بۆى چووە و پێناسەى کردووە و دەفەرموێت: (العقل: نور في القلب یعرف الحق والباطل )[2]، واتە: عـەقلْ نورێکە لە دلەوە و هەق و ناهەقى پێ دەناسێتەوە ، هەموو

---

(١) سورەتى الملك ئایەتى١٠.

(٢) بڕوانە: التعریفات للجرجانى (ب١- ل١٩٧) .

زانیاریەکیش سەرچاوە دەگرێت لە جیاکردنەوەی هەق و ناهەق .

هەر لەبارەی پێناسەی عەقڵەوە گوتراوە: (ما یعقل به حقائق الاشیاء) واتە: عەقڵ ئەوەیە ڕاستی و دروستی شتەکانی پێ دیاری بکەی و تێی بگەی.

کەواتە عەقڵ: هۆکارێکە یان ئالیەتێکە بۆ وەبەرهێنانی هزر و بیر و فکر بەگشتی، لە فکری ئیسلامی عەقڵ ئامرازێکە بۆ تێڕامان و وردبوونەوە لە (وەحی) و هەڵێنجاندنی زانستی و مەبەستەکانی، تێڕامان لە بونەوەر بۆ زانستی یاساکانی گەردوون.

## دووەم: دڵ.

مەبەستمان لە دڵ ئەم پارچە گۆشتە نییە، کە لەلای چەپی سنگی مرۆڤە و ڕۆژانە چەندین لیتر خوێنی بۆ بەشەکانی تری لەش دەنێرێت، بەڵکوو مەبەست لە دڵ ئەم بەخششە خوداییە کە قورئان دەیان کاری زۆر گرنگی بۆ دیاری کردووە هەموویان پەیوەندییان بەڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆ بە زانست و زانیاری و مەعریفە هەیە بەشێکیان دەخەینە ڕوو:

١. دڵ شوێنی باوەڕهێنانە تەنانەت باوەڕ بەبێ جێگیرکردنی لەناو دڵ قبوڵ نییە، ئەمەش بەشیکی سەرەکیە لەزانست و مەعریفە، خودای گەورە دەفەرموێت:﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ

﴿فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ﴾[(١)]، واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) باغەمبارت نەکات ئەوانەی کە بەپەلە بەدەم بێباوەڕی و بێ دینیەوە دەچن، لەوانەی کە بەدەم و زار دەڵێن: باوەڕمان هێناوە، بەلاّم دڵیان باوەڕی نەهێناوە .

٢. دڵ ناوەندی زیاد و کەمی ئیمانە. ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾[(٢)]، واتە: (بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێك ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت).

٣. دڵ ناوەندی ترسانە لەخودا، سەرداری زانست و مەعریفە ترسانە لەخودا: ﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ﴾[(٣)]، واتە: ( ئەوسا خوا ترسێکی فڕێدایە دڵیانەوە)

٤. دڵ ناوەندی ئارامی لاشە و دەروونە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾[(٤)]، واتە: (ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگاداربن دڵەکان: هەر بە قورئان و یادی خواو (پابەندبوون بەئاینەکەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە).

---

(١) سورەتی المائدە ئایەتی ٤١ .
(٢) سورەتی الانفال ئایەتی ٢ .
(٣) سورەتی الحشر ئایەتی ٢ .
(٤) سورەتی الرعد ئایەتی ٢٨ .

٥. دڵ ناوەندی نەخۆشی مەعنەویە: ﴿لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ﴾[1]، واتە: (خوای گەورە بۆیە ئەو دەسەڵاتەی داوە بە شەیتان تائەو (خەتەرەو خەیاڵ و وەسوەسەیەی) شەیتان فڕێی دەداتە نێو ئاواتی پێغەمبەرانەوە ببێتە هۆی سزاو تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی دوو ڕوویی و ناپاکی هەیە و بۆ ئەوانەش کە بەرامبەر ئایینی خوا دڵڕەقن).

٦. دڵ کانگای ڕەق بوونە لەکاتی دوورکەوتنەوەی مرۆڤـ لە (ئیمان): ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ﴾[2]، واتە: (هاوار و وەیل بۆ ئەوانەی کە دڵیان ڕەقە لەئاستی قورئان و یادی خوادا).

﴿ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ﴾[3]، واتە (پاشان لەوەدوا دڵەکانتان ڕەق بوو، (ئەی جولەکەکان) هەر وەك بەرد، بەڵکو ڕەقتریش).

٧. دڵ یەکەم بەشە لەلاشە کە لە ئیمان دور دەکەوێتەوەو بەکوێر وەصف دەکرێت:

﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ﴾[4].

---

(١) سورەتی الحج ئایەتی ٥٢ .

(٢) سورەتی الزمر ئایەتی ٢٢ .

(٣) سورەتی البقرة ئایەتی ٧٤ .

(٤) سورەتی الحج ئایەتی ٤٦ .

واتە : (ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆیشتوون بە دڵ و دەروونێکی هۆشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە (کوان : خەڵکانی ڕابردوو ؟ ئەو شارانە بۆ کاولکران ؟ کێ ئێمەی دروست کردووە ؟ ئامانج لە ژیان چیە ؟؟) یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان ببیستن و لێکی بکەنەوە ، جا وەنەبێت چاویان کوێر بووبێت ، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە وان لە سینەکاندا (چونکە هەر رواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە) .

٨. دڵ ناوەندی ترسان و ملکەچ بوونە بۆ خودای گەورە: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾[1]. واتە: (ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، دڵەکانیان بە نووری ئیمان ملکەچ و ڕووناك بووەتەوە، ترسی خوای تێدا بڕوێنن بەهۆی یادی بەردەوامی خوا و ئەو قورئانەی کە ڕەوانەکراوە، وەك ئەو کەسانە نەبن کە کتێبی ئاسمانییان بۆ رەوانەکرا، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دووروودرێژ، دڵیان ڕەق و ڕەش بوو).

٩. دڵ ناوەندی بیرکردنەوەیە بەهاوکاری عەقڵ :

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴾[2] .

(١) سورەتی الحدید ئایەتی ١٦ .

(٢) سورەتی الحج ئایەتی ٤٦ .

واتە : (ئایا ئەوانە بە زەویدا نەگەڕاون تا دڵیان هەبێ بیری پێ بکەینەوە یان گوێیان هەبێ گوێی پێ بگرن لە ڕاستیدا چاوەکان کوێر نابن بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لە ناو سینەکاندان).

١٠. دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەگوێ گرتنەوە هەیە.

﴿وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾[١]، واتە: ( مۆرمان دەنا بەسەر دڵەکانیاندا، جا ئەوان نابیستن).

١١. دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە فێربوونەوە.

﴿رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ وَطَبَعَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾[٢]، واتە: ( ڕازین لەگەڵ پیرەژنان و پەککەوتواندابن و بمێننەوە، خوایش مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا، بۆیە ئەوانە نازانن (خێر لە چیدایە)).

١٢. دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ گشت بەشەکانی لاشەوە هەیە ئەگەر چاك بوو سەرجەم کارەکان کە لاشە دەیکات چاك دەبن، ئەگەر خراپ بوو سەرجەم کارەکان کە لاشە دەیکات خراپ دەبێت. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: **(الا ان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله واذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب)**[٣]، واتە (ئاگادار بن پارچەیەك هەیە لە لەش ئەگەر چاك بوو ئەوە هەمو لاشەی چاك دەبێ،

---

(١) سورەتی الاعراف ئایەتی ١٠٠ .

(٢) سورەتی التوبە ئایەتی ٩٣ .

(٣) بوخاری گێڕاویەتیەوە (١/ ٢٠) ژ(٥٢)، هەروا موسلم (٥/ ٥٠) ژ(١٥٩٩) ژ(١٠٧) .

ئەگەر خراپ بوو ئەوە هەموو لاشەی خراپ دەبێ، ئاگادار بن ئەم پارچە گوشتە دڵە).

ئەم ئایەت و فەرمودانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە پەیوەندی دڵ بەسەرجەم بەشەکانی لاشە دەردەخات، فکری ئیسلامی دەوڵەمەند دەکات و سەرچاوەیەکی زۆر سەرەکی وەدەستهێنانی زانیاری و زانست و مەعریفەیە لە فکری ئیسلامی.

کاتێك دڵ ناوەندی جێگیربوونی ئیمانە ، ئیمانیش بڕیار لەسەر یەکتاپەرستیی خودا دەدات ، کەواتە دڵ ڕێگایەکی زۆر سەرەکی بەدەستهێنانی رۆشەنبیری و زانست و زانیاریی و مەعریفەیە لە فکری ئیسلامی و ناکرێ فەرامۆش بکرێ.

## سێیەم: پێنج هەستیارەکەی مرۆڤ

ئەم پێنج هەستیارە وەسیلە و ڕێگان بۆ پەیبردن بە شتە ماددییەکان, لەوێوە دەبێتە سەرچاوەیەکی تری رۆشەنبیری و زانست و مەعریفە بۆ مرۆڤەکان، گوێ هەڵدەستێ بەکاری گوێگرتن و چاو بۆ بینین و لووت بۆ بۆنکردن و زمان بۆ تامکردن و پێست بۆ هەست کردن، ئەم هەستیارانە بۆ ئەوەی لەگەڵ جیهانی دەرەوە پەیوەندییمان هەبێ زانست و مەعریفە کۆبکەنەوە لەریی خویانەوە مروڤەکان دەولەمەند بکەن، خودای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ

عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴾[1]. واتە: (ئەی ئینسان) لەشتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەكەوە كە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونكە بەڕاستی دەزگاكانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە).

ئەم هەستیارانە گشتیان ئامرازن بۆ رۆشەنبیری و زانست و زانیاری و مەعریفە.

## هەنگاوو سەرچاوەكانی تری رۆشەنبیری

بەهوی سنورداری و ناوچەیی شوینەكان جاران تاكی موسلمان دەیتوانی بەرۆشەنبیری و زانیاریەكی كەم هەنگاو بنێی و كارەكانی خوی رایی بكات، روداوەكان شی بكاتەوە، تێیان بگات و سودیان لی وەربگری، یان دونیا ئەوەندە فراوان نەبوو پێویستی بەرۆشەنبیریەكی گشتگیر نەبوو بەم ئەندازە فراوانەی ئیستا پانتایی ناوچەیی فراوان بووە، رۆشەنبیری گەلان تێكەل بووە بەیەكتر، دەیان بابەتی رۆشەنبیری سیاسی و ژینگەیی و یاسایی و وەرزشی و تەندروستی و ئەوانی تر بیونەتە پێویستی هەموو تاكێك، بۆیە دەبێ تاكی موسڵمان لەدونیای رۆشەنبیری بەجێ نەمێنێ و لەتەواوی ئەتەكێتی دونیاداری شارەزا

(١) سورەتی الاسراء ئایەتی ٣٦ .

بێت، رۆشەنبیری ئەوەندە فراوان بێت خەڵك لیۆەی فێربێ و ماموستای رۆشەنبیران بێ .

ئەو یاساو بنەمایانەی باسمان کرد سەرچاوەی سەرەکی رۆشەنبیری تاك بوون ، لە کوتاییدا چەند هەنگاویکی تر بەکورتی باس دەکەم بو زیاتر رۆشەنبیرکردنی تاکەکان و هەنگاو نانی زیاتر :

تاك گەر بیەوێ رۆشەنبیر بێ دەبێ خویندنەوەی بەردەوامی هەبی، بەهیچ شێوەیەك لەخوێندنەوە دانەبرێ بەتایبەت خوێندنەوەی بواری فکری و مێژوویی و فەرهەنگی و ژیاری.

١- خوێندنی بەردەوام لەزانستە سەردەمیەکان، چونکە لەوانەیە ئەو خوێندن و زانستەی دوێنی وەرتگرتووە بۆ ئەمرۆ بەس نەبێ یان دەست نەدات.

٢- دیراسەو لێکولێنەوە لە فکری سیاسی، چونکە جیاوازی هەیە لەنێوان کرداری سیاسی و فکری سیاسی، هەموو تاکێك پێویستە بو رۆشەنبیرکردنی خوی شارەزایی فکری سیاسی بیت، چونکە روداوەکان زۆربەیان لەچوارچێوەی فکری سیاسین، ئەگەر تاکەکان شارەزایی فکری سیاسی نەبن ناتوانن وەك پێویست روداوەکان بخوێننەوەو لێی فێربن.

٣- بەدواداچون وئاگاداربوون لە راگەیاندن ، بەتایبەتی ئەو راگەیاندنانەی ئامانج دارن و زانیاری ورد پێشکەش بەتاکەکان دەکەن.

٤- گەران بە وڵاتان و سود وەرگرتن لەتەجروبەی جیهان بەگشتی.

٥- سود وەرگرتن لەرۆشەنبیری گەلانی تر.

٦- بەشداری لەگونگرەو كونفراس و سیمینارو كۆرو كۆبونەوە رۆشەنبیریەكان.

٧- بەشداری خول و دەوراتی فكری و رۆشەنبیری.

٨- سود وەرگرتن و چاوپێكەوتن لەگەل كەسانی خاوەنی ئەزمون و رۆشەنبیرو بیرمەندان.

٩- لێكولێنەوە لەهەر روداوێك كە رودەدات " تا بزانین خالّی ئیجابی و سەلبی چیە؟ چۆن سودی لی وەرگرین؟ بۆچی رویداوە ؟ كێ لەپشتیەوەیە؟ كێ ئاراستەی دەكات و بۆ چ مەبەستێك لەو كاتە وروژێندراوە؟؟!!!!

## ئەم نامیلکەیەم بۆ نووسی

هەندێك دیاردە لەنێو خەڵكی مولتەزیم پەیدابووە كاتێك ئیلتزامی بەدینداری دەبێت، یان بەرەو ئیلتیزامی دینداری دەروات، زۆر بی ئاگا دەبێ لەچوار دەوری خۆی و روداوەكان ، واتێدەگات ئیلتیزام واتە بێ زانست و زانیاری و بێ ئاگاو بێ رۆشەنبیری بێت ، بێ ئاگابێت لەو رووداوانەی رۆژانە روودەدەن ، جاپەیوەندیان بەموسولمانانەوە هەبێ یان نا؟ لەجیهانی ئیسلامی بێت یان لە ولاتانی تر، خوێندنەوەی زۆر لاوازی بو دەكرێت لەلایەن بەشیك لەخەلكە دیندارەكە! زور جاریش سیناریۆكان بەناوی دینەوە لەسەر خەڵكی موسڵمان تاقی دەكرێتەوە، یان موسڵمان دابراوو گوشەگیر دەبێ، بەئەندازەیەك تیكەڵ بەكومەڵگا

نابێ تەنها لەسنوری مزگەوت و شوێنەکانی خواپەرستی دەبینریت، یان هەر بابەتیك باسی خواپەرستی نەبێ خوی لێ ناکاتە خاوەن و بەدونیاویستی دەزانێ و تێکەڵی نابێ و لێی دور دەکەوێتەوە، لە دونیای تەکنەلوژیاو سەردەم لەدواوەیە، ئەم ئاماژانە بۆتە دیاردەو سیمایەك بو هەندێك دیندارو مولتەزیم وەك بەزوبانی حاڵ بڵێن دیندار واتە بی ئاگا! یان بڵێن شوێنکەوتووی قورئان و سوننەت واتە نارۆشەنبیرو نەخویندەوارو بێ ئاگا، لەم روەوە بەم نامیلکەیە ویستم بیسەلمێنم کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەروازەو کاکڵی رۆشەنبیری و زانست و زانیاری و وشیاری و دانایی و وریاییە ، هەروەها دیندار و مولتەزیم دین و دونیا و روح و جەستە ، بەیەکەوە گرێدەدات و لێکیان جیاناکاتەوە، ئاگاداری کارو بارو رووداوەکانی دونیایەو دوارۆژیشی روناك وئاوەدانە، هیچ لایەنێك فەراموش ناکات ، هاوسەنگی لەتەواوی ژیانی داهەیە، هەروەها بەم نامیلکەیە بنەمایەکی گرنگی رۆشەنبیری دادەمەزرینی و بەرچاوی روون دەبێ لەنوێرا دیراسەیەکی تازە بو قورئان و سوننەت و توراسی ئیسلامی دەکاتەوەو تەکانی رۆشەنبیری خوی و خێزان و کۆمەڵگا دەدات، بەزانیاری و رۆشەنبیری کەم رازی نابیت.

## کوتایی بەرهەم:

هەر نوسراوێك دەنووسم حەز دەکەم دەست بخەمە سەر برینێکی تاکەکانی کۆمەڵگا کە بەم برینەوە دەناڵێنن، نامەوێ نوسراوێك بنوسم چەندان نوسراوی لەبارەیەوە هەبێ، یان تەنها وەك کۆکردنەوەی زانیاری بێت، هەروەها کاتێك بریار دەدەم بنووسم " تەماشای ئازارو گرفتەکانی بەردەم نەهزەو هەستانەوەو پیشەنگ بونی موسڵمانان دەکەم ، ئەم گرفتانە چین کە هۆکارن بۆ پاشەکشەمان؟ جوزئین یان کولی؟، فەرعن یان ئەسل؟، لاوەکین یان سەرەکی؟ گرفتەکە دەرەکیە یان ناوەکی؟ لەتوانای ئێمەدایە چارەسەری بکەین یان نا؟

بەرای بەندە ئێمە بەدەست کۆمەڵێك گرفتی ناوەکی دەناڵێنین کە بوونەتە هۆکار کە نەتوانین هەستانەوە و نەهزە بکەین ، بەڵام بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان لەپێش هەمو شتێك پێویستمان بەرۆشەنبیری تاکەکانی کۆمەڵگا هەیە، یەکێك لەگرفتە بڵاوەکانی نێو تاکەکانی کۆمەڵگای ئێمە نارۆشەنبیری بەشێکی زۆر لەتاکەکانی کۆمەڵگایە، تاکەکانی کۆمەڵگا ئەگەر رۆشەنبیر نەبن واقیع نەخوێننەوە، هەست بەپاشەکشەی کۆمەڵگا نەکەن ، نەزانن برینەکان لەکوێن، ئامانجی تاك چیە؟ شارەزاییان لەسەر فکرو بیردۆز و رەوتە کۆمەلایەتیەکان نەبێت، چون دەزانن بەکاری خویان هەلسن، هەنگاو بنین. نەهزەو هەستانەوە

پێویستی بە وشیاریەکی قولۆ و فراوان هەیە لەلای تاکی بیرمەند و کومەڵگا، تاکەکان کاتێك دەیانەوێ خویان و کۆمەڵگا بگۆرن، دەبێ رۆشەنبیریان لەبواری مێژوو دەرس و پەندەکانی، کۆمەڵایەتی و یاساو رێساکانی، لێکولێنەوەو دەرئەنجامەکانی، فکرو بیردۆزو ئامانجەکانی، فکری سیاسی و سیناریۆو لێکەوتەکانی، ژیارو بنەما سەرەکیەکانی، ژیان و پەیوەندییە هەمەلایەنەکانی، بوونەوەرو جوانی و سودەکانی، بەرامبەر و فێڵ و تەڵەکەکانی، ...هتد هەبێت ئینجا دەزانن چۆن گەشە بەخۆیان و کۆمەڵگا بدەن، بنەمای گۆرانکاری بڵاوبکەنەوە، دەست بەیاساکانی گۆرانکاری بگرن، خۆیان و کۆمەڵگا بەرەو ئاراستەی دروست ببەن. وڵاتانی پێشکەوتوو و خاوەن نەهزە یەکەم هەنگاویان لەبڵاوکردنەوەی رۆشەنبیری و وشیاری دەست پێکرد، تاکەکانیان رۆشەنبیرکرد، خۆیان و دەوروبەرو ئاستی کۆمەڵگایان پێ ناساندن، هۆکاری پاشەکشە و خاڵە لاوازەکانیان دیاری کرد، هۆکاری ناوەکی و دەرەکیان بەوردی دەسنیشان کرد، ئینجا هەنگاوی گۆرانکاریان نا،بەوەش بوونە پێشەنگ لەبواری تەکنەلوژیاو پێشکەوتنی ماددی، دیارە ئەم پێشکەوتنە یەك لایەنەیە، ئینجا پێویستی بەم هەموو بەرخودان و خەباتە هەیە ئەو نەهزەی ئێمە کەدونیا و دواروژە ، روح و لاشەیە، مادی و مەعنەویە، دین و ژینە، بێگومان رۆشەنبیری و وشیاری زیاتری دەوێ ، ئومێد دەکەم بەم نوسراوە کەلێنێك لەبواری رۆشەنبیری تاکەکانی کۆمەڵگا پر بکەینەوە،

چارەسەری برینێکی جەستەی کۆمەڵگا بکەین، خاڵێکی بچووکی وەرچەرخان بێ لەبۆ هەستانەوەو نەهزە، بەهیوای خوێندنەوەیەکی قووڵ و هەنگاوێك بەرەو چارەسەرێکی گونجاو.

د. ادریس کاریتانی. ٢٠-٢-٢٠٢٠.

# ناوەڕۆک

# بینای تاکی ڕۆشەنبیر

لەوەتـەی مـرۆڤ هاتۆتـە سـەرزەوی، لـە خـۆ ڕۆشـەنبیرکردن و گەشەسـەندن و بـەرەو پێـش چـوون بەردەوامـە، ئەگـەر چـی لەهەندێـک کات و شـوێن و زەمانێکـدا، بەشـێکی پاشەکشـەی کـردووە، بـەڵام بەشـێوەیەکی گشـتیی، هەوڵـی ڕۆشـەنبیریی و زیرەکیـی ودانایی و وشیاریی خۆیداوە، بەدوای زانست گەڕاوەو خۆی تێدا بەهرەمەند کردووە .

بـە سروشـتی خـۆی حـەزی لەڕۆشـەنبیریی و زانسـت و وشـیارییەوە، بەبـێ زانیاریـی ڕازی نابـێ، ململانێـی زانیاریـش لەنیـوان مرۆڤـەکان، هـەر هەبـووە وبۆتـە پاڵنەرێـکی بەهێـز، بـۆ

قورئـان و سـوننەتی سـەحیحی پێغەمبەر(صلـی اللـه علیـه وسـلم)، دوو سـەرچاوەی سـەرەکیی و دوو مەوسـوعەی پـڕ بەهـای ڕۆشـەنبیری و مەعریفـەی تاکـی موسـڵمانە، بۆیـە موسـڵمان دەبـێ وشیارو داناو زانـاو ئـاگادارو زیـرەک و ژیـرو ڕوشـنبیر بـێ ، پێچەوانـە لەگـەڵ خەڵکانـی تـر، چونکـە زانیاریـی لـەم دوو سـەرچاوەیە وەردەگـرێ، کـە هەڵـەی تێـدا نییـە و

هەروەهـا زانیارییـەکان لەچوارچێـوەی بنەمـاو ڕۆشـەنبیریی گشـتین، لەبوارەکانـی کۆمەڵایەتیـی و سیاسـیی و فیکریـی و گەشـەپێدان و ئابووریـی و، فەرهەنگیـی و تادەگاتـە ئـەدە و مێـ وو بەشـەکانی تـر، هەروەهـا بەهـۆی عەقڵـەوە بوونـەوەرو ژیـان، دوو سـەرچاوەی گـەورەی ژیریـی و داهێنـان و بیرکردنـەوەو وشـیاریین، تاوەکـو تـاک ڕۆشـەنبیر


**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوكردنەوە

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی










/TafseerOffice

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com


نرخی 3.000 دینار

